# گەشتێک بە ناو
# مێژوو، بەڵگەنامە، شوێنەوار



ھەڤپەیڤینێکی فراوان لەگەڵ
عەبدولڕەقیب یوسف

ئازاد عەبدولواحید

هەولێر 2005

# گەشتێک بەناو
# مێژوو، بەڵگەنامە، شوێنەوار

## هەڤپەیڤینێکی فراوان لەگەڵ
## عەبدولڕەقیب یووسف

**ئازاد عەبدولواحید**

هەولێر 2005

ناوی کتێب: گەشتێک بەناو.. مێژوو، بەڵگەنامە، شوێنەوار
هەڵپەیڤینی: ئازاد عەبدولواحید
نەخشەسازی: سەرکەوت وەلی
تیراژ: (٣٠٠٠) دانە
چاپی یەکەم - هەولێر - ٢٠٠٥
لە کتێبخانەی نیشتمانی ژمارە (٣٤٨)ی ساڵی (٢٠٠٥)ی دراوەتێ
چاپخانەی پەروەردە - هەولێر
سەرپەرشتیاری چاپ: چاپووک قادر ڕەشید
نرخ: (١٥٠٠) دینار

# پێشەکی

* عەبدولڕەقیب یووسف ناوێکە لەلای هەمووومان ناسراوە. لەوەتەی دەیناسم لە باسی شوێنەوار و مێژوو و کەلەپوور بترازێ شتی ترم لەو پیاوە نەبیستووە، تەنانەت کە ناوی دێ ئەو بوارانەمان بەبیر دێتەوە. بە مانای وشە عاشقی کارەکەی خۆیەتی و لەناویدا تواوەتەوە تێکەڵاوی ڕۆح و خوێنی بووە. لەو کاتانەدا کە لە مۆزەخانەی ئیتنۆگرافی سلێمانی پێکەوە کارمان دەکرد زۆر جار ڕێکەوتووە و بینیومە کە باسی سووتانی دەستنووسێک، یان بەڵگەنامەیەک کراوە، بەبێ ئیرادەی خۆی فرمێسک بە چاوەکانیدا هاتووەتە خوارێ.
* تا سەر ئێسقانی پیاوێکی پاکە، خوا ئەو بەهرەیەی داوەتێ لە کاتی کارکردن و ڕزگارکردنی شوێنەوارێ، بەڵگەنامەیێ، دەستنووسێ، نەخش و نیگارێ، خانوویەکی کەلەپووری، سەرماو گەرماو شەو و ڕۆژ و برسێتی و تێری لە بیر دەچێتەوە و هەموو هۆش و گۆشی دەکەوێتە لای ڕزگارکردن و جێبەجێ کردنی ئەو کار و ئەرکەی دەیەوێ بیکات. بەڕاستی خوا بەزەیی بە کەلەپووری شارستانی و مێژووی ئەم میللەتەدا هاتووەتەوە کە پیاوێکی وا بەخشندە و خۆڕاگر و دڵسۆزی بۆ ڕەخساندووە کە هەرگیز ماندووبوون لە فەرهەنگیدا نییە.
* بە پاکی و بەرائەتی خودایی خۆیەوە، خوا جورئەت و بوێرییەکی چاکی داوەتێ بۆ ئەوەی دژی ئەوانە بووەستێ کە ڕێز لە مێژوو و کەلەپوور و شوێنەوارو بەڵگەنامەو دەستنووسەکانی میللەتەکەی خۆیان ناگرن و بەگژیاندا دەچێتەوە، خواش بۆ ئەو ئەرکە پیرۆزە پاراستوویەتی.
* لە ڕاستیدا ئەو پیاوە بە قەدەر دەزگایەک کاری کردووەو ئەرکی دەزگایەکی نەتەوەیی تەواوی لە کاتە ناسکەکاندا ڕاپەڕاندووە، بەو تەمەنەوە پێیەکی لە هەولێر و یەکی لە دهۆک و کەرکووک و خانەقین و ئاکرێ و زاخۆ و قەرەداغ و ئەحمەداواو هەڵەبجە و تەوێڵە و بیارە و... و.. تاد دایە. وەک نووسەرێکی نەتەوەیی کارەکانی بۆ بەشەکانی دیکەی کوردستانیش گوێزاوەتەوە، بۆیە ئەوەی بە خۆی کرابێ درێغی نەکردووە، دەنا کەسانی دیکەی بۆ ڕاسپاردووە و ڕێنمایی کردوون بۆ کارکردن و نووسین. ئێستاکە وا خەریکە بەری ڕەنجی فەرهادانەی ئەو پیاوە ماندوونەناسە دێتە بەرهەم و مریدو هاوبیرانی ڕۆژ بەڕۆژ ڕوو لە زیادبوونن کە هیچیشیان پێ نەکرێ (اضعف الأیمان) بە قسە پشتیوانی لە کارو ئەرک و پەیامە پیرۆزەکەی دەکەن، هیچیان پێ نەکرێ ڕێگە و کارئاسانیی بۆ دەکەن تا لەسەر ئیشی خۆی بەردەوام بێ، من لە دەمێکەوە هاوکارو پشتیوانی ئەو خزمەتگوزارەم، لە هەشتایەکانەوە لە

نزیکەوە دەیناسم و تێکەڵاویم لەگەڵیدا هەیە، زۆر جار پێکەوە هەندێ کارو پرۆژەمان ڕاپەڕاندووە، وەک پاراستنی کێلی قەبرەکان و تۆمارکردنی چەندین کاسێت بە دەنگی پیرەمێرد و بەساڵاچووان. نایشارمەوە کە فەزڵێکی زۆری بەسەرمەوە هەیە لەوەی ئەو هەستەی لە سەرەتای لاویمەوە بۆ ئەرشیف و کەلەپوور و گرنگیی مێژوو هەمبوو، کاتێ ئەوم ناسی دە ئەوەندەی دی ئەو ئەرکەم لەلا خۆشەویستتر و قووڵتر و ڕەگاژۆتر بوو.

* هەر لە ساڵی (١٩٦٠)هوە بیری لەوە کردووەتەوە لە بواری مێژوو و کەلەپووردا کار بکات، بۆیە هەر لەو ساڵەدا دەفتەرێکی قوتابخانەی کڕیوە بۆ ئەوەی لە (زاخۆ) بیرەوەرییەکانی (سۆفی مەحموودی شاخی) تۆمار بکات. لەم بارەیەوە دەڵێ: چەند دێڕێک زانیاریم لێوەرگرت، پاشان نازانم چۆن بوو گفتوگۆیەکەمان دواخست، ئیتر لە دوای ئەوە بارودۆخەکە بە لێدانی شۆڕشی ئەیلوول لەلایەن (عەبدولکەریم قاسم)ەوە گۆڕا، (سۆفی مەحموود)یشم لەدەست چوو کە مێژوویەکی گرنگ و زانیارییەکی زۆر فراوانی لەبارەی بەدرخان و شۆڕشەکەی و عەشایری بۆتان و سەرۆکەکانی لە زەمانی بەدرخانەوە تا ساڵی (١٩٦٠)هەبوو. (سۆفی مەحموود) پیاوێکی زۆر بە تەمەن بوو، بە قەولی خۆی میری بۆتانی دیبوو، هەروەها مامۆستا عەبدولڕەقیب دەڵێ: تا زیندوومە ئەو پیاوەم لەبیر ناچێ. پاشان لە ساڵی (١٩٧٢)دا لە بەغدا بیرەوەرییەکانی (مام فەندی گویی)م تۆمار کرد، دوای ئەوە لە ساڵی (١٩٧٤) بۆ یەک کاتژمێر بیرەوەرییەکانی بلبلی کوردستان (محەمەد عارف جەزراوی)م لە شاری بەعقووبە لە ماڵی خۆمان تۆمار کرد.

* لە ناوەڕاستی هەشتایەکاندا هەڤپەیڤینێکی دوورو درێژم لەبارەی گرنگیدان بە مێژوو و بەلگەنامەو کەلەپووری شارستانیی کورد لە تەلەفزیۆنی کەرکووک لەگەڵ سازکرد کە پەیام و مەبەستەکەی هوشیارکردنەوەی خەڵکی کوردستان بوو، وا ئەمڕۆش جارێکی دی بە ئەرکی سەرشانی خۆمی دەزانم لە گفتوگۆیەکی دوور و درێژدا دووبارە بەسەری بکەمەوە، چونکە پێم وایە ئەو کارەی دەیکا قوتابخانەیەکە چەندین کەسی تێدا پێگەییوە. ئەو هەڤپەیڤینە دوورو درێژە کە ماوەیەکە لەگەڵیم ئەنجام داوە، بەشێکی لە گۆڤاری (ڕامان)دا بڵاوکرایەوە، بۆ سوودگەیاندنی زیاتر بە پێویستم زانی سەرجەمی گفتوگۆیەکە کە پڕە لە زانیاری بەسەریەکەوە چاپ بکەم. هیوادارم لە سوودگەیاندن بەدوور نەبێ!

**ئازاد عەبدولواحید**
**هەولێر - ٢٠٠٢**

* هۆی گرنگیدانت بە بواری تۆمارکردنی بیرەوەری بەساڵاچووەکان و ئارکیۆلۆژیا و کەلەپووری نەتەوایەتی و فۆلکلۆرو مێژوو چییە؟ پاشان لە کام لەم بوارانەدا هەست دەکەیت زیاتر سەرکەوتووی؟

– لە منداڵییەوە هەر کەس بەهرەی لە شتێکدا هەیە، یان حەزی لە بابەتێکە، زۆر کەس چاوپێکەوتنیان لەگەڵ کراوە، هەریەک بە جۆرێک وتوویەتی حەزم لە فلان بابەت بووە، من لە منداڵییەوە حەزم لە هەواڵی میرانی بۆتان و زانیاری دێرینە بوو، ئیتر لە بەهاری شەستەوە دەستم دایە مێژوو نووسین و لەوێوەش کەوتمە سەر شوێنەواری کورد تا بیناسم و لەبارەیەوە بنووسم.

لە سەرەتای حەفتاکانەوە کتێبێکم لە بارەی دەوڵەتی دۆستەکی نووسی، لەبەر ئەوە سەرچاوەی زۆرم بۆی خوێندەوە، بەتایبەت ئەو کتێبانەی لەبارەی شارستانیەتی ئیسلامییەوە بوو، بابەتی شوێنەوارو هونەری شێوەکاری وەک مەسەلەی (ئیبنولڕەزاز)ی جزیری و ئەمانەم دی، ئەمەش کلیلی حەز کردنم لەو بابەتانە بوو. کە لە بەعقووبە بووم بۆ دۆزینەوەی سەرچاوە هاتوچۆی کتێبخانەو دائیرەی شوێنەوارم دەکرد، ئیتر کەڵکەڵەی شوێنەوار کەوتە سەرمەوە، بەتایبەتی پاش ئەوەی زانیم لە کوردستان کەس بایەخ بە هونەری بیناسازی و نەخش و نیگاری کۆن نادات، هەموو ساڵێک هاوینان لە بەعقووبەوە دەهاتمەوە کوردستان و ئەو گەشتانەم دەکرد، چونکە بۆشایی زۆر هەبوو و کەس بایەخی پێ نەدەدان، زانیم ئەم کەلەپوورە خەریکە لە ناو دەچێ، ئەمەش هۆکاری سەرەکی بوو کە پاڵی پێوەنام ئەو کارانە بکەم، من تا ئێستا توانیومە شازدە هەزار وێنەی شوێنەواری و کەلەپووری شارستانێتی لە کوردستانی باکوورو باشوور و خۆرهەڵات بگرم، نازانم زیاتر بایەخم بەکام بەشی مێژوو یان فۆلکلۆر یان شوێنەوار داوە، چونکە چێژم لە هەموویان وەرگرتووەو ئیشم بۆ هەموویان کردووە، تەنانەت هەوڵی سەیرم بۆ کەلەپووری بەڵگەنامەیی کوردی داوە، هەروەها هونەری نەخش و نیگار و تەلارسازی تا بابەتی مێژوویی، بە ڕاستی ناتوانم مەیلی هیچ لایەک بەسەر ئەوی تردا بدەم.

* وەک لە نزیکەوە ئاگام لێیە زۆرجار گلەیی لە کەمتەرخەمی ڕووناکبیرانی کورد دەکەن، کەمتەرخەمییەکەیان لەچیدایەو چارەسەری ئەو کەمتەرخەمییە بەلای تۆوە چییە؟

- نووسەرانی کوردو پێشینانی ئێمەش زۆر کەمتەرخەمییان کردووە، بۆ نموونە: «محەمەد ئەمین زەکی بەگ» کە مێژوونووسێکی مەزنە و پێی سەرسامم، لە زەمانی ئەودا دەیتوانی بە فەردە بەڵگەنامەی سەردەمی بابان لەلای خەڵک و ئەمەلاو ئەولادا کۆبکاتەوە، کەچی لە کتێبەکەیدا یەک بەڵگەنامەی تێدا نییە، یان (مەردۆخ) دەیتوانی بەفەردە بەڵگەنامەی بابان و ئەردەڵان کۆبکاتەوە، کەچی یەک بەڵگەنامەی لە کتێبی کوردو کوردستان داخڵ کردووە. هیچ جۆرە بایەخدانێ بە سامانی بەڵگەنامەیی لەلای پێشینانی ئێمە نەبووە، ڕۆشنبیرانی کورد لەم بوارەدا کەمترین ڕۆڵیان نەبووە و نەیانتوانیوە بەڵگەنامە بپارێزن و بچنە سەر ئەم ماڵ و ئەو ماڵ و ئەم دائیرە و ئەو دائیرەو نەهێڵن فەرمانبەری بێئاگا بەڵگەنامە بسووتێنێ، هەرچەند ساڵێ جارێک فەرمانی لەناوبردنی نووسراوی دایەرەکان دەهات، بە گوێرەی ڕێنمایی بنکەی سەرەکی بەڵگەنامەکان، بە فەرمانگەکانی دەگوترا لیژنە دروست بکەن و بیانپشکنن، ئەوەی بەڵگەنامەیی بوون بابەتەکانیان لە لیستێکدا دەنووسرا کە نابێ فڕێ بدرێن، لیستەکان دەنێردرانە لیژنەی باڵای وەزارەتی ناوخۆ لەوێ بڕیار دەدرا لەناو ببرێن، یان نا. کەچی ئەوانەی لای خۆمان یەکسەر دەچوون بە فەردە کۆیان دەکردنەوەو لە قەراخ شار دەیانسووتاندن، ڕۆشنبیرانی کوردیش خۆیان لە سامانی بەڵگەنامەیی کورد نەدەکردە خاوەن، تەنانەت مێژووناسانیش گوێیان نەدەدایێ. خۆت چاک ئاگەداری لە بارەی بابەتی شوێنەوارەوە کامە ڕۆشنبیری کورد هەبووە شوێنەوارێک لە مەترسیدا بووبێ نامەیەکی بۆ دائیرەی شوێنەوار نووسیبێ، یان بەدوای داچووبێ، یان لە کوردستان بەرگریی لێکردبێ. ئەگەر هەیە پێم خۆشە بیڵێی، نە لەکاتی حکومەت نە لەپاش ڕاپەڕین. جاروبار هەبوون شتێکیان لە ڕۆژنامەیەکدا نووسیوە کە شوێنەواری کوردستان تاڵان دەکرێ و کەس بەرگری لێ ناکات.

* ئەمە بە مانای ئەوە نییە کە بیری مێژوونووسین لەلای کورد لاوازە؟

- سامانی بەڵگەنامەیی کوردستان لە ڕاپەڕیندا زۆری سووتێنران، کەسم نەدی لەم بوارانەدا شتێک بڵێ، ئەمەش بەڵگەیە کە بیری مێژوونووسین لەناو کورددا لاوازە، ڕابردوو بریتییە لە مێژوو، شوێنەواری شارستانی، بەڵگەنامەکانی ڕابردوو، هوشیاریی ئەم بابەتانە لەناو ڕۆشنبیران لاواز بوون، لە حەفتاکاندا ئێمە زیاتر بەمەمان زانی کە پێشتر ئەو هوشیارییە نەبووە، لە

حەفتاکاندا گرووپێ پەیدا بوون بەناوی (ڕوانگە) بەناوی ئەدەبەوە لە ئەدەبیان دەدا، ئەمانە گاڵتەیان بە مێژوو و کەلەپوورو فۆلکلۆر دەکرد و بەکۆنەپەرستییان دەزانی، گاڵتەیان بە شاعیرانی وەک: مەلای جزیری و پیرەمێرد و مەحوی و نالی دەکرد، ئەمانە گەورەترین گورزیان لە کەلەپوورو شوێنەوار و بەڵگەنامە وەشاند، تەنانەت بڕوایان بە ئەدەبی پێش خۆیان نەبوو، دژی ئەوە بوون لەسەر ئەدەبی دێرین لێکۆڵینەوە بکرێت، دەرگایان لەسەر ئەو لێکۆڵینەوەو نووسینانە داخست، لە کاتێکدا لێکۆڵینەوە دەبێتە هۆی دەوڵەمەندکردنی زانیاری و ڕۆشنبیریی لەلای خەڵکی، حکوومەت کە بینی ئەم تەوژمە لەگەڵ بەرنامەی سیاسیی خۆی گونجاوە، لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان شوێن و ڕێگەی بۆ دانان و ئەوەی پاڵپشتی لەو تەوژمە دەکرد بۆیان بڵاو دەکردەوەو پاداشتیان دەکردو هانیان دەدان، ئەمانیش دژایەتی هەموو ئەوانەیان دەکرد کە باسی ڕابردوویان دەکرد، چونکە بڕوایان بە کەلەپووری نەتەوایەتی نەبوو، ببوونە بەربەست لەبەردەم گەشەکردنی هوشیاریی شوێنەوارو کەلەپووری شارستانی، حکوومەت بایەخی بەم ڕێبازە دەداو نووسەری کوردیان بەتەنیا لەسەر بابەتی سەرەکی (شیعرو چیرۆک) ڕادەهێنا، بەمەرجێ ساردوسڕ بن، تەرجەمەی شتی بێگانەش هان دەدرا، بە مەرجێ پێوەندی بە کوردەوە نەبێ، ئەم سێ بابەتە بوونە تەوەری سەرەکی گۆڤارەکانی ئەو کات، سەرژمێری هەندێکیانمان ماوە، بۆ ئەم مەبەستە سەیری کتێبەکەمان **«بانگەوازێک بۆ ڕووناکبیرانی کورد»** بکەن.

* کەواتە ئێوە گلەیی و ڕەخنەتان لەو بارەیەوە لە گۆڤار و ڕۆژنامەکان زۆرە کە نە هوشیارییان بڵاو کردووەتەوە و نە بایەخی بەرچاویان بە کەلەپوور داوە؟

- جار هەبووە گۆڤارێکی سەد لاپەڕەیی تەنیا دوازدە لاپەڕەی پێوەندی بە کوردەوە هەبووە، ئەمەش سیاسەتێکی ناسراوی داگیرکەرانەیە، کە داگیرکەران دەچوون وڵاتێکیان داگیر دەکرد هەوڵیان دەدا میللەتی ژێردەستە لە ڕابردووی خۆی دابڕن، تا بیر لە ڕابردووی خۆی نەکاتەوە، چونکە مێژوو و شوێنەواری ئەو میللەتە دەبنە هۆی دامەزراندنی بیری نەتەوەیی و هۆی خولقاندنی گیانی بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ داگیرکەران، دەزانن بەمە هەستی شانازیی لەلای میللەت دەخولقێ و قۆناغی شۆڕش و ڕاپەڕین ئامادە دەکات، لەبەر ئەوە حکوومەت هەوڵی دەدا خەڵک لە مێژوو و شوێنەوار دوور بکەوێتەوە، بۆ

نموونه: له جەزائیر نووسەرێکی فەرەنسی لەکاتی گرتنی جەزائیردا لەسەر کەلەپووری بیناسازی جەزائیر شتێکی نووسی، دەسەڵاتی فەرەنسی له جەزائیر ئەو کەسەیان دا به دادگا، وتیان ئەم نووسینه لەلای خەڵکی جەزائیر دەبێته هۆی دروست بوونی بیری نەتەوایەتی، ئەمەش هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ چەقبەستنی فیکر، حکوومەتیش پێی خۆش بوو نووسەران بیر له بابەتی گەرموگوڕ نەکەنەوە، بۆیه (٨٠٪)ی خوێندەواری به بابەتی لاوەکییەوه خەریک کرد، تەنانەت ئەو نووسەرانەی لەناو شۆڕش بوون بەهەر هەموویان بەهۆی ڕێبازی (ڕوانگه)وه سەد لاپەڕەیان له بارەی ئەو شۆڕشەوه نەنووسی، بیریان له مێژوو نەکردەوه کە خۆیان بەشێک بوون لەو مێژووە، دەچوون بابەتگەلی بێگانەیان وەردەگێڕا، وەک ئەو بابەتانەی سەبارەت به شۆڕشەکانی ئەفریقیاو کوباو ئەمانەیان له گۆڤارەکانی شۆڕشدا بڵاودەکردەوه، یان دەچوون شیعری ڕەمزییان بۆ گۆڤارەکانی شۆڕش دەنارد و مێژوویان پشت گوێ دەخست.

* ئەزموونی نەبوونی هوشیاریی مێژوویی و نەتەوەیی کارێکی کرد لەبەرچاوی نووسەرەکانمان خەڵکێکی زۆر دەچوون قەبرو کێلی قەبری باوو باپیرانیان دەشکاند و دەپشکنی، کەلەپووری وێنەیی سەرەتای ئەم سەدەیەی دوایی کە لەگەڵ هاتنی کامێرا وێنه گیرابوون، له دۆڵابەکاندا مشک و مۆرانه خواردیانی، بینایەی کەلەپووری تێک دەدرا، ڕووناکبیرانی کورد نارەزاییان دەرنەدەبڕی و ورتەیان نەدەکرد، لاوازیی هوشیاریی نەتەوەیی و مێژوویی کارێکی کرد تەنانەت هوشیاری یاداشت نووسینەوەش له کوردستان کز بێ، لەم ســـــاڵانەی دوایی نەبێ تاک و تەرا پەیدا بوون ئەو یاداشت و بیرەوەرییانەیان دەنووسییەوە، بەڵام دوای ئەوەی زۆر کەسی گرنگ له ژیانی مێژوویی و ڕۆشنبیری و سیاسیی ئەو میللەته مردن و ئەو هەموو بیرەوەرییانەیان لەگەڵ خۆیان بردە ژێر گڵەوە، بەڕێزتان لەم بارەیەوه دەڵێن چی؟

– ئەگەر به بیرت بێ جارێکیان من و جەنابت چووینه گردی سەیوان له سلێمانی بۆ ئەوەی وێنەی هەندێ لەو کێله نەخشدارانەی ئەوێ بگرین، گەڕاین و گەڕاین و هیچمان نەدی، له خزمەتکاری مەرقەدی (شێخ مارفی نۆدێی)م پرسی وتی: مەسەلەی ئەوە دوور و درێژە، خەڵک هەموویان شکاند، هەندێک

عەبدولڕەقیب یووسف - ئازاد عەبدولواحید

لەو کێلانە نانەوایەکان بردوویانە، چونکە ئەو کێلانە لە بەردی گوندی واژەیە لە پشت ئەزمەڕ و بە گەرمی ناتەقێ و بەرگەی ئاگر دەگرێ و لە دروستکردنی فڕندا بەکاری دێنن، دوایی ئەو قوتابیانەی ناوەندی و دواناوەندیش کێلەکانیان دابووە بەر بەرد و شکاندبوویانن، منیش ئەمەم کردە ڕەخنەو وتم ئەوە سووچی مامۆستایانە، ئەگەر مامۆستا قوتابی هوشیار بکردایەوە، ئەوە نەدەچوون کێلی نەخشداری قەبری باووباپیران بدەنە بەر بەرد و بیشکێنن، چونکە ئەوە نەخش و هونەرو کەلەپوورو مێژووە. سوپای عیراق لە ساڵی (١٩٨٨) کە گەیشتە بناری قەندیل کۆمەڵێ لەو کێلە نەخشدارانەی گوێزایەوە بەغدا، تەماشا بکەن ئەوان چۆن نرخی کێلە قەبری کۆنیان دەزانی، کەچی ئێمە خۆمان دەچووین دەمانشکاندن.

کۆمەڵێ بینای زۆری پڕ لە نەخش و نیگار لە کۆیەو سلێمانی و هەولێرو کەرکووک هەبوون، ئەو خانووانە بە نەخشی جوانی دەستکردی (عەلی نەقاش کەرکووکی) کە دەوری لەو نەخشە جوانانەدا هەبووە، یان (ئیسماعیل و عەلی ئەکبەری سنەیی) لەپێش جەنگی جیهانی هاتوونەتە ئێرە و کۆمەڵێ خانوویان لە قەڵای هەولێر نەخشاندووە کە ئێستاش هەندێکیان هەر ماون، (گوڵ محەمەد سنەیی) و (وەستا حەبیب)ی خەڵکی سلێمانی و هی دیکە کە

نەققاش بوونەو هونەرێکی جوانیان لە کوردستان بەجێهێشتووە، ولاتانی دیکە بەتایبەتی تورکیا زۆر بە باشی ئەم جۆرە خانووانە دەپارێزن، کە چوومە شاری (سنە) وێنەی ئەو خانووانە بگرم، پێشتریش زۆر هیوام بوو بچمە ئەو شارەوە، دیتم لە لایەن حکوومەتەوە دەستیان بەسەردا گیراوە، هەرچەندە ئیستیملاکی نەکردبوون، بەلام ئەوەی قەدەغە کردووە خاوەنەکانیان کەمترین گۆڕانکاری لەو خانووانەدا بکەن، تەنیا بە ڕەزامەندی و سەرپەرشتیی دائیرەی شوێنەوار نەبێ، تا وەک خۆی ئەو خشتانە دابنرێنەوە، تەنانەت حکوومەتی جمهووری ئیسلامی کلێسەی (سنە)شی کردووە بەبینای کەلەپووری و پاراستوویەتی.

خانووی کەلەپووری لەلای هەر میللەتێ سەر بە هەر سەردەم و ئایینێک بێ بە پیرۆز تەماشا دەکرێت، وەک کەلەپوورێکی شارستانی ئەرکی ئەو دەولەتەیە بیپارێزێ، ئینجا چ هی جوولەکە، یان ئیسلام، یان مەسیحی، یان زەردەشتی بێ پێویستە ئەو شوێنەوارە بمێنێ و بپارێزرێ.

لە کوردستاندا بەداخەوە زۆریان لەناو چوون، هەندێ دەولەمەندی نامەسئوول کەوتوونەتە وێزەی جام و کەرەسەی خانووی کەلەپووری و گەڕەکە کۆنەکان و دەیکڕن و دەیرووخێنن و لە شارەکاندا دەیکەنە دوکان و بازاڕو گەراج، ئەمە مەترسییەکی دیکەیە لەم سالانەدا پەیدا بووە، کە ئەم کەلەپوورە بیناسازییە لە چەندین بوارەوە وەک سەرچاوەیەک سوودبەخشە بۆ لێکۆلینەوەی بیناسازی نەتەوەیی، ئەکادیمی و نائەکادیمی، مرۆڤی زیرەک دەتوانێ نموونەی جوان لەوانە بۆ هونەری بیناسازی کوردی ئەمڕۆمان سوودی لێ ببینن، هەروەها بۆ کاری نمایش کردن پێویستە، ئەگەر چیرۆک و ڕووداوی کۆن نمایش بکەین پێویستمان بەم خانووانەیە، چونکە کۆشکی نوێی گەورە لەگەل نمایش و فیلمی مێژوویی و کۆن ناگونجێ، بۆ هونەری شێوەکاری ئەگەر هونەرمەند ئەو کەرەسە کەلەپووریانە ببینێ زۆر بەکەلکە، هەندێ لەو خانووانە هی کەسایەتیی ناوداری کوردن، یەکێک لەوانە هی عەزیزبەگی کوڕی عەبدولڕەحمان بەگی پاشای بابانە، ئێستا خانووی (بابەعەلی)یە یانی بابە عەلی شێخ مەحموودی نەمر، یان خانووی میرێکی ئامێدی کە ئێستا هی (حاجی مستەفا کەتانی)یە، ئەمانە پێویستە بپارێزرێن، تەنانەت خانووی (شێخ محەمەدی خال) لە سلێمانی کە یەکێکە لە گەورە زانایانی کوردستانی سەدەی بیستەم، خانووی ئەومان بە خانووی کەلەپووری تۆمار کردووەو پێویستە بمێنێ، خانووی

ئەم جۆرە کەسایەتییانە زۆر پێویستە بمێنن، خانووی (مەلای گەورە) لە کۆیە کە بە کەلەپووریمان تۆمار کردووە دەبێ ئیستیملاک بکرێ و خاوەنەکەی نەیفەوتێنێ، چونکە یاد و یادگاری ئەو کەسایەتی و زانا گەورەیەیە.

* چارەسەر چییەو چۆن بتوانین هۆشیاری مێژوویی و کەلەپووری لەلای خەڵک دروست بکەین؟

- بۆ چارەسەر زۆر هۆکار هەن هەر لە تەلەفزیۆن و ڕادیۆکانەوە ڕێنمایی بڵاو بکرێتەوە تا خەڵک لە بەرانبەر مێژوو و کەلەپوور هوشیار بکەنەوە، گلەیی دەکەین کە کورد مێژووی خۆی نەنووسیوە، کە وایە لە باتی ئەوەی خەریکی وەرگێڕانی چیرۆکەکانی بێگانە بین بۆچی مێژووی خۆمان نەنووسین؟ بۆچی لە بارەی ئەم هەموو کارەساتەی کوردستان نانووسین؟ کوردستان لەبارترین وڵاتی دنیایە بۆ نووسینی مێژوو، چونکە ئەو ڕووداو و کارەساتەی لە کوردستان ڕوویان داوە لە هیچ شوێنێکی دنیادا نەبووە، لە کۆمەڵگا زۆرەملێیەکاندا هەر پیرەمێردێ بگری مێژوویەکە بۆ خۆی. بۆ نموونە ئێستا ئەوانەی خەڵکی باڵەکایەتین لە کۆمەڵگەی (پیرزین)ن هەریەکێکیان لەوانەیە بڵێ سێ- چوار جارماڵم سووتاوەو چەندین کارەساتت بۆ دەگێڕێتەوە، ئەوە هەمووی مێژووە. بۆ ناچینە سەر لێکۆڵینەوەی ئەدەبی خۆمان؟ زیندوو کردنەوەی مێژووی ژیانی شاعیرانی خۆمان و دۆزینەوەی بەرهەم و دەستنووس و شیعریان؟ گۆڤارەکانیش دەیانتوانی ئەو ڕۆڵە باشە ببینن، پێویستە گۆڤار بابەتی سست و خاو لە خاوەنەکانیان وەرنەگرن کە کاریگەریی بۆ مێژووی کورد نییە، ڕێزم هەیە بۆ شاعیران و چیرۆکنووسان، ئێمە پێویستە چیرۆک و شیعریشمان هەبێ، بەڵام هەندێ شتی بێ کاریگەر بڵاو دەکرێنەوە خەڵکیان لێ ماندوو بووە. وەرگێڕانی بابەتی بێگانە بە دەردێکی ڕۆشنبیریی دەزانم، زۆربەی گۆڤارەکانی سلێمانی نیوەی زیاتریان بابەتی بێگانەیە.

گۆڤارەکان زۆر بابەتی وەرگێڕانیان تێدایە، لە سلێمانی گۆڤارێ بەناوی (سەردەم) دەردەچێ کە تایبەتە بە وەرگێڕانی بابەتی بێگانەو زۆربەی هەرە زۆری پێوەندی بە کوردەوە نییە، کە لەباتی ئەوە لێکۆڵینەوەو بابەتی مێژوو بوایە زۆر باشتر بوو، ئەم دەردەش لەناو نووسەرانی کورد لە پێش ڕاپەڕین پەیدابووە، ئەمەش لاوازی ئەو کەسانە دەگەیەنێ، چونکە ماددەی زانستییان لەسەر کەلەپووری شارستانی پێ نییە، بابەتێک لە گۆڤارەکانی عەرەبی زمان

بڵاوکراوەتەوە ئەوان وەری دەگێڕن و پاداشتی پێ وەردەگرن، ئەمەش نیشانەی زیرەکی نییە.

* پێت وایە وانەی ئەرکیۆلۆژیا لە زانستگاکانی کوردستان بخوێندرێ، ئەگەر بخوێندرێ چۆن ئەنجام بدرێ و چ پێشنیارێکت بۆ ئەم بوارە هەیە؟

– زانستی ئەرکیۆلۆژیا لە کوردستان دواکەوتووەو پسپۆڕانی شوێنەوار ژمارەیان زۆر کەمن، ئەوانەش کە هەن زۆربەیان نووسینیان نییە، زۆر پێویستە بەشی شوێنەوار هەبێ، بەڵام مامۆستا نییە، ئەگەر لە زانکۆی سلێمانی و سەلاحەدین هەندێ مامۆستای وەک (د. بهنام أبوالصوف) بۆ کوردستان بانگ بکەن وانە لە زانکۆکانی کوردستاندا بڵێنەوە کارێکی باشە، ئەوسا کۆمەڵێکی باش لە دەرچووانی شوێنەوار پەیدا دەبن و زیاتر کاریان پێ دەکرێت، چونکە ئەو کادیرانە نوێن و بە دڵسۆزی کاردەکەن و تووشی گەندەڵی نەهاتوون، ئێستا هەندێ لە دەرچووانی بەشی شوێنەوار بوونەتە بەڵا بەسەرییەوەو زۆر زیانیان بە شوێنەوار گەیاندووەو فەوتاندوویانە، چەند ساڵێک پێش ئێستا لە بارەی خانوویەکی کەلەپووریم نووسی، ئەو خانووە کاتی خۆی بەهاندانی من دەزگای شوێنەوار کڕی، کە خەستەخانەی سەربازیی ئینگلیزەکان بوو، نەخش و نیگارو پەنجەرەی ڕەنگاوڕەنگی دەستکردی وەستا (قاسمی سنەیی) تێدا بوو، دەزگای شوێنەوار لەبەر سیفەتی مێژوویی ئەو خانووەی کڕی، بەڕێوەبەری شوێنەواری سلێمانی ئەوسا ئەو خانووەی کاوڵ کردو دەرگاکانیشی دەرهێناو خستییە خانووی ماڵی خۆی کە ڕۆژنامەکان لەسەریان نووسی، پێویستە بەشی شوێنەوار لە کۆلێژی ئاداب هەبێ، هەروەها وانەی تایبەت بە شوێنەواریش لەناو هەموو کۆلێژەکاندا هەبێ، تا نرخی لەلای خەڵک بزانرێ، زیاتریش بۆ مەبەستی هوشیارکردنەوە بێ کە شوێنەوارناسەکانی خۆمان بەپێی ئەزموونی شوێنەوارناسیی ئەو دەورە ببینن.

* من لەو باوەڕەدام جارێ لەو قۆناغەدا کاری هەڵکۆڵین و پشکنینی شوێنەوار ڕابگیرێ، چونکە پێداویستی تەواومان نییە.. ئێوە دەڵێن چی؟

– منیش پێم وایە کاری هەڵکۆڵین و پشکنین لە کوردستاندا ڕابگیرێ، چونکە ئاڵۆزە و زانستی دەوێت تا بزانرێت هی چ قۆناغێکە. بۆ نموونە لە گردی چراغ لە شارەزوور کە دەزگای گشتی شوێنەواری عیراق پشکنینی تێدا کرد لەبەر بەنداوی دەربەندیخان کە مێژووی حەوت هەزار ساڵە گیا

ئەسپوونیان تێدا دۆزییەوە، واتە گیاسابون کە لە بیستەکانیشدا بەکار هاتووە، ئەگەر ئێستا بەهار بێت و بارێ گیا ئەسپوون بۆ لای ئاسارییەکانی کوردستان بهێنن نایناسنەوە، منیش هەر نایناسم، خۆ ئەگەر رزیبێ و حەوت هەزار ساڵ لەناو گلّدا مابێتەوە چۆن دەزانین ئەمە چ گیایەکە؟

هەڵکۆڵینی شوێنەوار ئەگەر بە نەزانی بکرێ، ئەوە زیانی زۆرترەو زۆربەی زۆری مانای شوێنەواری و مێژوویی خۆی کە لەناو ئەو گلّەدایە بزر دەبێ، ئەوەش لەبەر نەبوونی شارەزایی ئەو کەسانەو نەبوونی تاقیگەیە..

* ڕات چۆنە گۆڤارێکی سەربەخۆمان هەبێ سەبارەت بە مێژوو؟

- گۆڤاری تایبەت هەبێ باشە، ئەگەر لەمەولا بابەتی مێژوویی لەلایەن گۆڤارەکانەوە هان بدرێن ئەویش زۆر باشە؛ تا هانی خەڵک بدەن بەرەو مێژوو نووسین، مەرج نییە گۆڤار هەبێ، ئەگەر هەشبێ ئەوە بە سوودترە. من پێم باشە مێژوونووسێک بێ، بۆ نموونە (د. جەمال ڕەشید) لێرەیە مێژوونووسێکی زۆر بە توانایە، حەز دەکات خزمەت بکات، (د. عەبدولفەتاح عەلی یەحیا) سەرپەرشتی ئەو گۆڤارەی دهۆک دەکات کە گۆڤاری شارەوانی دهۆکە من پێی موعجەبم، دەبێ یەکێک ئەو کارە بکا پسپۆڕ و بەتوانا بێ، ئینجا ئەو گۆڤاری مێژووە بەڕێوە ببات..

* هاوکێشەیەک هەیە کە بەهاوکێشەی ڕەسەنایەتی و هاوچەرخایەتی ناسراوە، هەمیشە دەبێ کۆن بە تەنیا کۆن نەبێ، بگرە بە سەردەمەوە ببەسترێتەوەو لەگەڵ ژیانی ئەم سەردەمە بگونجێ، تۆ چۆن ئەو هاوکێشەیە دەبینی؟

- بەراوردی مێژوو لەگەڵ ئێستا هەیە، ئێمە دەتوانین پێکەوەیان گرێ بدەین، بۆ نموونە لە چاککردنەوەو دەستکاری کردنی خانووە کەلەپوورییەکان ڕێگە هەیە هەندێ لایەنی پەرە پێ بدەین، هەندێ ئەندازیار چێژ لە کەلەپوور وەرناگرن، لەلای ئەوان ئەو کەلەپوورە هیچ نییە، ئەگەر خانوویەک دەستکاری بکات هەرچاوی لە نەخشەی ئەندازەیی نوێ دەبێ، ئەوەی لەلا باشە هەمووی بە شێوەی نوێ بکات، بەڵام هەیە بینایەکە لەسەر هونەری بیناسازی کۆن، بەڵام بە کەرەسەی نوێ دروست دەکات، ئەوە پێوەندییە لەنێوان کۆن و نوێ...

بەڕای من مرۆڤ چەند خەریکی کۆن بێ، نابێ لە ڕۆشنبیریی نوێ دابڕاو بێ، ئەوەی نوێخوازیش بێ نابێ شتی کۆن بە کۆنەپەرستی بزانێ، هەر کەسێ

له گۆڤارەکانی ئێمە شتی هاوچەرخ بنووسێ دەشتوانێ بابەتی کەلەپووری پشت گوێ نەخات، بە پێچەوانەوەش هەر ڕاستە، ڕۆماننووس دەتوانێ ڕووداوێکی کۆنی کوردەواری بکاتە سەرچاوەی بابەتەکەی.

هەندێ بەناوی نوێخوازی شت دەنووسن، وتاریان تەنیا لە کۆمەڵێ دەلالەت پێکدێ، نەمن و نە خۆی و نە خوێنەر لێی تێناگەین، ئەوەی بەم شێوەیە بڵێ من نوێخـوازم، ئەوە توانای خـۆی بە فـیـرۆ دەدات. لێکۆڵینەوەی بواری کـۆمـەڵایەتی و سـیـاسی و ئابووری و مـێـژوویی کـورد بکات لەو وتارە بێ سەروبەرانە باشترن کە بەناوی نوێخوازییەوە دەنووسرێن، چونکە کەڵکیان نییە.

* پێت وایە مێژوونووسی زانامان هەبێ، ئەگەر هەیە کێیە؟

- هەندێ مـێـژوونووسـمـان هەن، هەیە (اختصاصی)یەو هەشە بایەخ بە زۆربەی مێژوو دەدات، بۆ نموونە (د. جەمال ڕەشید) یەکەم مێژوونووسی کوردە کە بایەخ بە مـێـژووی کۆن دەدات، چوار کـتـێـبیم دیوە کە چوارەمـیـان (لقاء الأسلاف)ە و بە چەند نوسخەیەک بڵاوبۆتەوە.. کتێبەکانی وردن، هەم لایەنی مـێـژوویی هەم زمـانەوانین، لەبارەی زاراوەی زمـانەوانی کـە بە زمـانە مسمارییەکان نووسراون، ئەم دکتۆرە چەند زمانێکی بێگانە دەزانێ و سوودی لێ وەرگرتوون، کە پێشتر زۆربەی مێژوونووسان ئەو سەرچاوانەیان نەدیوەو هەندێکیشیان ئەو زمانانەیان نەزانیوە.

لام وایە لە دوو بواردا لێکۆڵینەوەی زۆر چاک دەکات. سەرچاوەش بەکاردێنێ و بابەتەکانیشی سەختن، لەبارەی مێژووی هەولێرەوە (د. موحسین محەمەد) و مامۆستا (زوبێر بیلال ئیسماعیل) ڕۆڵیان زۆر بووە، (د. کەمال مەزهەر) لە ماوەی نێوان دوو جەنگدا لە مـێـژووی نوێی ئەم سەردەمانە چەند کـتـێـبێکی هەیە. مامۆستا (مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی) بەڕاستی لە مێژووی نوێ و سەدە ناوەنجییەکان زانیاری زۆری هەیە، زانیاری بەرفراوانی لە چەند زانستێکدا هەیە کە خەڵکی تر ئەو زانیارییانەیان نییە، مامۆستا (مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس) خزمـەتی چاکی کردووە لەوانەش: (یادی مەردان) و (بنەماڵەی زانیاران) کە زانیاری باشی تێدایە، هەرچەندە مامۆستا (مەلا عەبدولکەریمی بیارە) زۆر کـەس بە مـێـژوونووسی دانانێ، چونکە شـێـوازێکی بریقـەداری ئەکادیمی نییە، هەروەها (د. ئیسماعیل شوکر) و (د. جەمال نەبەز) و (د.

حوسامەدین نەقشەبەندی) کە لەبارەی ئەمارەتی حەسنەویە تێزی ئاکادیمی هەیە، د. ئیسماعیل تێزی ماجستێرەکەشی لەبارەی دەوڵەتی شەدادییە، ئەمانە تێزی باشن کە هێشتا بڵاونەکراونەتەوە، هەروەها (د. جەبار قادر)یش لە بارەی مێژوو دەنووسێ، لەوانەشە ناوی هەندێکیانم لەبیرچووبێ. بە نیسبەت قەبارەی مێژووی کوردەوە، مێژوونووسی کورد زۆر دەگمەنن.

* چەمکی مێژوو لەلای تۆ چییە، چۆن لەو چەمکە مێژووییە دەڕوانی، ئایا شیکردنەوەی مەتریالی بۆ مێژوو لەلای تۆ پەسەندە؟

– شرۆڤەکردنی ماددی بۆ مێژوو قوتابخانەیەکی مارکسی ناسراوە، بەڵام زانایانی خۆرئاوا لەسەر ئەو ڕێبازە کاریان نەکردووە. لەلای من ئەو لێکدانەوە ماددییە لاوازە و زێدەڕۆیی تێدایە، چونکە هەموو شتێکی بردۆتەوە سەر لایەنی ئابووری، ئەو هەموو شەڕوشۆڕ و ڕووداو و دیاردانەی کە ڕوویانداوە بردوویەتییەوە سەر مەسەلەی ئابووری، زانایانی سەرمایەداری میسالیانە مێژوویان لێکداوەتەوە، تەفسیری مێژوو ئەگەر بەپێی لێکدانەوەی نەتەوەیی کرابێ کارێکی چاکەو قۆناغێکی پێویستە، بەڵام نەچێتە دۆخی عاتیفە و موبالەغەو ئەمانەوە، بۆ نموونە «إعادة کتابة التاریخ» قۆناغێکی پڕ لە موبالەغە و هەڵە و پەلەپەلەیی بوو، ئامانجێکی نەتەوەیی هەبوو، بەڵام بۆ چەواشەکردنی مێژووە، لە هەندێ کەس دەبیستم کە دەبێ کورد مێژووی خۆی سەرلەنوێ بنووسێتەوە، من ئەمجۆرە ڕەوتە هان نادەم، چونکە جارێ کورد مێژوونووسی کەمە کە هەر یەکێکیان لە بوارێ پسپۆڕ بێ تا بێین دووبارە بینووسینەوە، پێویستە (٥٠–٦٠) ساڵی تر ئەو کارە بکرێ، مەرجیش ئەوەیە زانستییانە بکرێ.

* کورد کۆمەڵێ شۆڕشی کردووە، ئایا ئەو شۆڕشانە بە تەواوی و زانستییانە هیچیان لەبارەوە نووسراوە؟ ئەگەر نەنووسراوەتەوە چۆن؟ ئەگەر نووسراوەتەوە کەموکوڕی لەو بوارەدا چییە؟

– شۆڕشەکانی کورد بەگشتی زۆر کەمیان لەبارەوە نووسراوە، شۆڕشی بەدرخان کوا چییان لەسەر نووسراوە؟ شۆڕشی محەمەد پاشا ڕواندزی د. جەمال نەبەز هەندێکی لە بارەوە نووسیوە، بەڵام زۆری تری لێ نەزانراوە، ڕەنگە لە دوارۆژدا بەڵگەنامەی مێژوویی زۆر کە لە سەردەمی عوسمانی و قاجاری و ئەمانەدا نووسراون بکەونە بەردەستی خەڵکانی مێژووزان، ئەوەی

ئێمە دەینووسین هەمووی هەڵبژاردەی هەندێ سەرچاوەن و زۆر کەمە.
هەروەها شـۆڕشـەکـانی بارزان و کـۆمـاری مـەهاباد کـەس بەتەواوی لێکۆڵینەوەی لەبارەیانەوە نەنووسیوە، ئەوانەی لە شۆڕشەکانیشدا بەشداربوون بە تەواوی نەیاننووسیـوە. (د. جەلیلی جەلیل) لەبارەی شـۆڕشی (شێخ عـوبەیدوڵڵای شـەمـزینی) لە دیکۆمـێنتـەکـانی ڕووس زانیـاریی باشی دەسکەوتووەو کـتـێـبـێکی باشی داناوە، ئەگـەرنا هیـچی وا لە مـێـژووی شۆڕشەکانی کورد نەنووسراونەتەوە، تەنانەت شۆڕشی (٣٠) ساڵەی خۆمان، من نەمدیوە کەسێک سەد لاپەڕەی لەسەر تەجروبەکانی ئەو شۆڕشە نووسیبێ، ئێستا هەندێک یاداشت و ڕاپۆرتی خۆیان دەنووسن، بەڵام زۆر بەڵگەنامەی شۆڕش و زانیاریی بزربوون، کە مومکین نییە زیندوو بکرێنەوە.
* دەرفـەتێ هاتۆتە پێش هەندێ لە بەڵگەنامـەکـانی تورکـیـاو ئێـران هی (٣٠-٤٠) ساڵی پێش ئێـسـتـا خراونەتە بەردەست، پێت وایە لیـژنەیەکی پسپۆڕ و زانا هەبێ بۆ نووسینی مێژووی کورد سوود لەوانە وەربگرن، ئێستا لە تورکیا دەڵێن بۆ بەڵگەنامەی عوسمانی دەرگا لەسەر پشتە تا تەماشا بکرێن و پۆلێن بکرێن؟
- مەڵبەندی بەڵگەنامەی عوسمانی (٢٥٠) ملیۆن بەڵگەنامەی تێدایە و (٥-٦) ساڵە ڕێک خراون، «عەلی ئەمیری» کە زانایەکی خەڵکی دیاربەکرە لە کاتی عوسمانیدا پێڕستی بۆ کۆمەڵێکی زۆر لەو بەڵگەنامانە کردووە، بەڵام هەرچی لە بەرژەوەندی کورددایە نەیانهێشتـووە کـورد کـەڵکی لێ وەربگرێ، بیـسـتـم فـەرەنسـاییـەک لە ئەنقـەرە چووبوو بۆ لایان، وتبوویان تۆ تاقـیبی مەسائیلی کوردی دەکەی بواری پێنەدرابوو، ئەگەر بشزانن کوردی، بوارت پێ نادەن سەیری ئەو بەڵگەنامانە بکەی. لە مەڵبەندی بەڵگەنامەی ئێران (٤٠) ملیـۆن بەڵگەنامـەی تێدایە، کـە ئەوان بۆ خۆیان بەزنجیـرەو بە شێـوەی کـتـێب بڵاویان دەکـاتەوە، بەڵام مەڵبەندی بەڵگەنامەیی ئەستەنبووڵ وا بزانم تەنیا یەک بەرگی لەو بارەوە دەرکـردووە، بێگـومـان کـۆمـەڵێکی زۆری لەبارەی کوردستانەوە تێدایە، عوسمانییەکان عەقڵییەتێکی بەڵگەنامەیی جوانیان هەبووە کە پێشتر خەڵکەکە نەیبووە، بۆ نموونە دەوڵەتی عـوسمـانی تۆمارو سجلاتی وڵاتی جەزائیر کە زانیویەتی لێی دەکشێتەوە لەگەڵ خۆی هێناویەتی، یان دەبینین دۆسیەی هەندێ شارو پارێزگا پێش دووسەد ساڵ لەمەوبەر لەناو

ئەرشیفی عوسمانیدا پارێزراون، ئەوە سامانێکی گەورەی مێژوویییە بۆ مێژووی خۆرهەڵات.
* ئەم گرنگیدانەت بە ئەرکیۆلۆژیاو کەلەپووری نەتەوایەتی و فۆلکلۆرو مێژوو، تا ئێستا بەروبوومەکەی چی بووە؟
- لە بەهاری (١٩٦٠)ەوە دەستم کرد بە نووسین لەبارەی مێژووی کوردەوە تا ساڵی (١٩٨٠)، یان پێش ئەوە بە دوو ساڵێ بایەخم بە مێژوو دەدا، لەم بارەیەوە چەند کتێبێکم هەبوو، یەکەمیان کتێبی (أعلام) بوو، کە بریتی بوو لە مێژووی ناودارانی کوردو زانایان و میران و ئەمانە، کتێبێکی ترم نووسی بەناوی «الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى» کە بە هەردوو بەرگەوە «٩٠٠» لاپەڕە دەبوو، بەرگی یەکەم لە (١٩٧٢) چاپ کرا، بەرگی دووەم لە (١٩٧٥) چاپ کرا، بەڵام ئەمەی دوایی حکوومەت لە چاپخانەی «حوادث» لە بەغدا دەستی بەسەر سێ هەزار دانە چاپکراوەکەی داگرت، ساڵێک دەستی بەسەرداگرت و پاشان ناردییە لای دوو لیژنە بۆ خوێندنەوەی، دوایی بڕیاریاندا هەمووی بنێرنە کارگەی دروست کردنی کاغەز لە بەسرە، تا بیکەنە هەویرو بکرێنەوە کاغەزی سپی، ئەمە وای کرد بەشی دووەم بڵاو نەبێتەوە کە تایبەت بوو بە شارستانیەتی دەوڵەتی دۆستەکی، ئیتر بۆ دانانی ئەم کتێبە سەرچاوەی زۆرم لە نامەخانەی گشتی بەعقووبە خوێندەوەو یەکەم کتێبخانەش کەڵکم لێوەرگرتبێ نامەخانەی مۆزەخانەی مووسڵ بوو، هەروەها «مكتبة المتحف العراقي» زۆر هاتوچۆیم دەکرد، بەهۆی دانانی ئەم کتێبەوە کەوتمە سەر خوێندنەوەی بابەتی شارستانی و لەناو مێژوودا بایەخی تایبەتیم پێدا، یەک لەو لایەنە گرنگانەش شێوەکاری و بیناسازی سەردەمی ئیسلامی بوو، ئەم کتێبەش بووە کلیلی کردنەوەی زۆر بابەتی تر لە لام.
لە تەمووزی ساڵی (١٩٧٧)ەوە دەستم کرد بە بایەخدان بە هونەری بیناسازی و هونەری نەخش و نیگاری ناو خانووە کەلەپوورییەکان، یەکەم جار لە شاری مدیاتی قەزای ماردین دەستم پێکرد، لەوێ کۆمەڵێ خانووی نەخشدار کە بە بەردو گەچ ئاوا کرابوون وێنەیانم گرت، ساڵی دووەم لە کوردستانی باشوور دەستم بە ناساندنی خانووە کەلەپوورییەکان کرد و لەسەریانم دەنووسی، ئەوە (٢٣) ساڵە خەریکی ئەو بابەتانەم، کەس لە کوردستان هێندەی من بایەخی بەولایەنە نەداوەو تا ئێستا بە هەزاران وێنەم

گرتووه، که تەنیا لەو بوارەدا ڕەنگە لە حەوت هەزار وێنە کەمتر نەبێ، (١٦) هەزار وێنەی خانووی کەلەپووری و شوێنەوارەکانی کوردم گرتووە، لە (خانی والی پشت کوھ) و (بن تاقی مالّی چەلەبی) لە شاری مەندەلییەوە تا ڕۆژهەلاّتی وان و مووش و دیاربەکر، تا قەلاّی دم دم و ناوچەی موکریان و سەقزو سنە.

که لە ساڵی (١٩٨٠) بۆ شاری سلێمانی گوێزرامەوە؛ نەمزانی مەسەلەی شوێنەوار و بەلّگەنامە و کەلەپوور لە کوردستان بەم ڕادەیە بێ خاوەنە، چەندین دائیرەی شوێنەوار لە کوردستان هەبوون، بەلاّم ئیفلیج بوون و چالاکییان نەبوو، بەرانبەر شوێنەواری کورد کەمتەرخەم بوون، لە هەندێکیاندا کەسانی وا هەبوون شوێنەوارو کەلەپووری کوردیان بەتالاّن دەبرد، ئەگەر کادیرو فەرمانبەری دلّسۆزیشیان هەبوایە لەژێر دەستی بەڕێوەبەری کەمتەرخەم هیچیان پێ نەدەکرا.

ئیتر من کەوتمە گەڕان و بەرگریم لەو شوێنەوارانە دەکرد کە خەلّک هەلّیان دەوەشاندنەوە، یان دامودەزگاکانی حکوومەت خۆی دەسکاری دەکردن و وێرانیان دەکردن بە بیانووی دروست کردنی شەقام و ڕێگەو بینایەی حکوومی تێکی دەدان، یان هەر سوودێکی دیکەی بۆ دامودەزگاکانی خۆی هەبوایە.

زوو زوو ڕاپۆرتم بۆ دامودەزگای شوێنەوار لە بەغدا دەنووسی، دامودەزگاکە بەتایبەتی بەڕێوەبەری گشتی ئەوێ و کارمەندەکانی هەموویان دلّسۆز بوون، ڕاپۆرتەکانی منیان فۆتۆ دەکردو ڕەوانەی دائیرەی شوێنەواری (سلێمانی و هەولێر و دهۆک) دەکران و ئاماژەیان پێدەدان کە تەجاوز لەسەر فلاّن بینایەی شوێنەوار هەیە، کەچی بەداخەوە زۆربەی ڕاپۆرتەکان لەلایەن دائیرەکانەوە پشتگوێ دەخران، دەزگای گشتی شوێنەوار هەولّی پاراستنیانی دەدا، کەچی ئەوانەی لای خۆمان لەناویاندا هەبوو هەر خۆیان بەشدار بوون لەوێران کردنیان. لەودوە بابەتی شوێنەوار بووە بابەتێکی گرنگی من تا بە ئەمڕۆش دەگات، لەوساوە زۆر شوێنەواری کوردستانم دۆزیوەتەوەدو لەسەریانم نووسیوە و وێنەیانم گرتووە.

* ئەی بەرهەلّستی کردنتان و ڕێگەگرتنی بەردەوامتان لە سووتاندنی ئەوراقی دامودەزگایەکانی حکوومەت؟

– ڕاستە بابەتێکی دیکەی گرنگ بەرهەلّستی کردنی سووتاندن و

لەناوبردنی ئەوراقی ڕەسمیی دامودەزگاکانی حکوومەت بوو، بەڵگەنامەکانی هەر وڵاتێک لە ئەوراقی ڕەسمی حکوومەت پێکدێ، چونکە زۆرن و بابەتەکانیشیان بەکەڵکن، ئەوراقی خەڵک، ئەوانەی ناودارو زاناو ناسراو بوون و نامەکارییان لەگەڵ خەڵکدا کردووە، ئەم لایەنە لەگەڵ گرنگییەکەی بەنیسبەت سامانی بەڵگەنامەیی شتێکی کەمە، بۆیە من بەناو بنەماڵەکاندا دەگەڕام، ئەوانەی ئەوراقی گرنگی شوێنەوارییان هەبوو دەیانووت پار، یان پێرار سووتاندوومانە، یان دەیانووت فەوتاندمانن، لەبەر نەبوونی هوشیاریی لە پاراستنی شتی کەلەپووری و شوێنەواری و بەڵگەنامە زیانێکی زۆر بە سامانی بەڵگەنامەیی گەیشت. لە دائیرەکانیش هەر چەند ساڵێ جارێ فەرمان دەهات بۆ لەناوبردنی ئەو بەڵگەنامانەیان، کە دەبوایە بەگوێرەی ڕێنماییەکانی مەڵبەندی بەڵگەنامەکان ئەو ئەوراقانە بپشکنرێن، چونکە هەر دائیرەیەک ئەوراقی ئیتلاف بکردایە، دەبوو لیژنەی بۆ پێکهێنن، ئەو لیژنەیە داوای مۆڵەتی لیژنەی باڵای دەکرد ئایا ئەو ئەوراقە ئیتلاف بکرێت یان نا؟ هەر کاغەزێ قابیلی ئەوە بوایە بۆ مێژوو سوودی لێ وەربگیرێ، ئەوە ئیتلافی قەدەغە بوو، کە دەبوو بپارێزرێ و پێشکەشی مەڵبەندی بەڵگەنامەیی بکرێ، پاش ئەوە دەبوایە لیستیان بناردایە و لیژنەی سەرەوە لەوێ دیراسەی دەکردو ئەگەر ڕازی بوایە لەسەر ئیتلاف دەیووت تەلەفی بکەن، بەڵام فەرمانبەرانی کوردستان یەکسەر لۆری کاغەزیان بار دەکردو لە قەراغی شارەکان دەیانسووتاندن، من بەرگریم لە کەلەپووری بەڵگەنامەیی دەکردو لە دژی ئەم دائیرانە ڕاپۆرتم بۆ مەڵبەندی نیشتمانی دەنووسی، جار هەبووە بۆ وەزارەتی ڕاگەیاندن یان ناوخۆ یان حوکمی مەحەلی دەمنووسی بۆ ئەوەی ڕێگە لەم دائیرانە بگرن، بۆ نموونە لە شوباتی ساڵی (١٩٨٣)، شارەوانی سلێمانی دەیان تەن ئەوراقی ڕەسمیی زەمانی پاشایی و عوسمانی لە کارگەی قیری تانجەڕۆ سووتاند، پاش ئەوەی زانیمان ماوەی سێ ڕۆژ چووین لەوێ هەندێ لەو کاغەزانەی لەبەردەمی بلدۆزەردا مابوون، دەوری بیست هەزار بەڵگەنامەم هێنایەوە، بۆ نموونە یەکێک لەوانە سجلێکی زەمانی شێخ مەحموودی نەمر بوو، چواردە هەزار بەڵگەنامەی شارەوانی تێدایە، ئەمە گەورەترین زیان بوو بە ئەوراقی ڕەسمیی کەوت، بەتایبەتی لە شارەوانی کە دایکی دائیرەکانی شار بووە، تەنانەت کاروباری لە قەوارەی خۆی فراوانتری هەبووە، برووسکەیەکم لە

شێوەی پرسە نارده مەڵبەندی بەڵگەنامەکان و تێیدا ڕوونم کردەوه کە شارەوانی ئەو هەموو بەڵگەنامەیەی سووتاندووە، ئەگەرچی وەختی خۆی تەقدیرم لەسەر قەبارەی ئەو کاغەزانە ڕاست نەبوو، چونکە دوای لێکۆڵینەوە بۆم دەرکەوت زۆر لەوە زیاتر بوون کە من تەقدیرم کردبوو.
ئەو برووسکەیەم بە مێژووی (١٩٨٣/٣/٢٧) بۆیان نارد، هەندێک لە ئەوراقەکانی شارەوانی مابوون و لەژێرزەمینی شارەوانیدا چەندین جار بە کاک (نووری وەشتی)م وت با بیان پشکنم و ئەوانەی بەڵگەنامەن لێیان جیا بکەمەوە سوودی نەبوو، بۆیە هەندێ لەبەرپرسیاریەتی سووتاندن و لەنێوچوونی ئەوراقەکانی تانجەڕۆش لە ئەستۆی ئەو دان، چونکە منی ئیغفال کردو دەستی دەستی پێدەکردم تا ڕۆژی ٩/١٠-١٩٨٨/١٠ هەندێک کەس لە شارەوانی ئەو ئەوراقانەیان دایە (عەباسە کوێری خانەقینی) کە ئەمە شوفێرێک بوو تەنیا ئیشی ئەوە بوو کاغەزی ڕەسمیی دائیرەکان دەربهێنێ و بە پارە یان بە بەلاش بیداتە کارگەی کاغەزی بەسرە، ئەم جارەشیان دوو لۆری بۆ کارگەی بەسرە بردو ئەوەی لە ژێر زەمینەکەدا مابوون هەمووی بردە ئەوێ، کە بەمەم زانی پێیانم ڕاگەیاند کەسێکی لە دوو بنێرن لە ڕێگە بیگێڕێتەوە، ئەم بەیانی نا ئەو بەیانیان بە من کرد تا مانگێکی خایاند، پاشان بە ڕەسمیی فەرمانبەرێکیان بەناوی کاک ئەسعەد فەوزی میرزا بەپێی نووسراوی ڕەسمی ژمارە «١٧٠٥٤» بە مێژووی «١٩٨٨/١١/٩» نارد، ئەو کاتەش کار لە کار ترازابوو، ئەوراقەکانیان لە کارگە کردبووە هەویرو کەپسیان کردبوو. کاک ئەسعەد فەوزی گەڕایەوەو ڕاپۆرتێکی دایە دائیرەی شارەوانی سلێمانی کە دانەیەکی لەلامەو ڕۆژی (١٩٨٨/١١/١٢) گەیشتبووە بەسرە پێیان وتبوو: بەڵێ ڕاستە دوو لۆری پڕ لە ئەوراق لەلای ئێوەوە بە فڵان ژمارە لەلامان تۆمارکراوە، ئەو ئەوراقانە لەگەڵ زۆر ئەوراقی تر کەپسمان کردوون، بە ڕاستی ئەمە زیانێکی زۆر گەورە بوو کە نزیکەی یەک ملیۆن بەڵگەنامەی شارەوانی سلێمانی لەناوچوون.

ئەم کارە زیانێکی گەورە بوو لە کەلەپووری بەڵگەنامەیی کورد کەوت، ئەمانەم بە درێژی لە یاداشتێکدا نووسیوە. نامەیەکی شەش لاپەڕەییم بۆ مەڵبەندی بەڵگەنامەکان نووسی کە چۆن سامانی بەڵگەنامەیی لە کوردستان بەهۆی نەبوونی هوشیاری لەناوخەڵکدا زۆری لەناو دەچێت و زۆریشی بەرەو

خۆش بوو، نامەکەی من و وەڵامی خۆیانی لە ڕۆژنامەی عێراق لە ڕۆژی (١٩٨٣/٣/١٢)دا بەناونیشانی «التراث الوثائقي المفقود في منطقة الحكم الذاتي» بڵاو کردەوە. ئەو کاتە ئەمینداری مەڵبەندی بەڵگەنامەکان مامۆستا «سالم الآلوسی» بوو، کە هەر خۆشی دامەزرێنەری ئەو دەزگا گرنگە بوو، پیاوێکی زۆر دڵسۆزو وریا بوو، کە زۆر نووسین و تەعریفاتی لەم بارەیەوە هەیە.

بە مێژووی (٤/٥/ ١٩٨٤) دیسان بیرخەرەوەیەکی دوورودرێژم بۆ مەڵبەندی بەڵگەنامەیی نووسی و دانەیەکیم لێ دایە کۆڕی زانیاری کوردو دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی و بەڕێوەبەرایەتی خوێندنی کوردی و ئەمینداریتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان لە هەولێرو داوام لێکردن کە مەڵبەندێکی بەڵگەنامەیی یان لقێکی ئەو مەڵبەندە لە کوردستان دابمەزرێ و لە ڕۆژنامەی عێراقدا لە ڕۆژی ١٩٨٤/٣/١٢ بڵاوکرایەوە، کەچی هیچ یەکێک لە دەزگاکانی ڕۆشنبیریی کوردی خۆی نەکردە خاوەنی ئەم پرۆژە گەورەیە کە دەتوانرا لایەنێکی ڕەسمیی داوا بکات و ئەو دەستپێشکەرییە بکات، چونکە هیچیان هوشیارییان بەگرنگی ئەو پرۆژەیە و دڵسۆزییان بۆی نەبوو. زۆر نامەو برووسکەم بۆ مەڵبەند دەنووسی، وەڵامیشم بۆ دەهاتەوە کە زۆربەیان لە یاداشتەکانی خۆمدا ئاماژەم پێداون و لە بەرگێکدا ئەو نامە و برووسکانەم بەرگ کردووە، زۆر هەوڵم دەدا هوشیاری لەناو فەرمانبەرانی دامودەزگاکان بڵاوبکەمەوە، سەردانم دەکردن و دەچوومە لایان.

* بێجگە لە شارەوانی وەک ئاگەدارین خەریکی زۆر فەرمانگە و شوێنی تر بوویت تا بەڵگەنامەکان بپارێزن.

– لەو شوێنانەی جێی بایەخم بوو بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی سلێمانی بوو، پێوەندیم پێیانەوە کرد بۆ ڕۆشنبیرکردنی ئەفسەرەکانی پۆلیس، لەوانەش شێخ قادری شێخ محەمەدو موقەدەم فوئاد کەسانی زۆر دڵسۆز بوون، تەنانەت یاریدەدەری بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس زۆر حەزی لەم بابەتە بوو، لە ڕۆژی (١٩٨٦/١٢/٢٤) لە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس لیژنەیەکی ڕەسمیی دروست کرا کە بە نووسراوی ژمارە (٩٠٢) دەرچوو، لیژنەکە بەسەرپەرشتیی من بوو بۆ

(٨-٩) پۆلیسیان دەدامێ تا ئەو ئەوراقانە بپشکنین، (٣١٤) فەردەمان تەنیا لە یەک مەخزەن هێنا و سێ مانگ کارمان لە ناویاندا کرد، دوای ئەوە تۆپبارانی ئێرانی بەسەردا هات، کاتێ یەک لەدوای یەک دەست بە بۆردومانی سلێمانی کرا، ئیتر نەمانتوانی لەسەر کاردکەمان بەردەوام بین، مەزەندەم کرد حەوت سەد هەزار بەڵگەنامە لە ناو ئەوراقی پۆلیسدا بوون و جیام کردنەوە کە لە هەموو بوارێکی تێدا بوو، تەنانەت زۆر بڵاوکراوەی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانی تێدا بوو، ئەو ئەوراقانە بە دەستی خەڵک لەسەر سنوورەکان دەسگیر کرابوون، ئەوراقی دائیرەی کشتوکاڵ (٥٣٠٩) ئیزبارە بۆ تەلەف دانرابوون، دەستم بەسەر ئەوانیشدا گرت، لیژنەم پێ دروست کردن و بەمانگێ هەموویان پشکنی، ئەوەبوو (٦٤٥) ئیزبارەم لێ دروست کردن و هەموویم خستە ناو فەردەو هێنامنە جێگەیەک لەسەر سەربانی ئیدارەی محەلی لەوێ خەزنم کردن. هەر لەو ژوورەدا ئەوراقێکی زۆری کۆن هەبوو، من و کاک عەبدوڵلا ئاگرین ئەو ئەوراقانەمان بۆ ماوەی سێ ڕۆژ فەحس کرد، ئەوراقەکان کۆن و گوومشکاوی ببوون، سێ پشیلەی تۆپیومان تێدا دۆزینەوە.

هەموو ئەو ئەوراقانەم بۆ پاراستن هێشتەوە، بەڵام لە ساڵی (١٩٩٢) یاریدەدەری پارێزگار (شەوکەت عزەت) هەمووی کە چل تەن دەبوو دایە کارگەی کلینیکسی (نەجمەدینی حاجی ڕەشید) کە زانیم چووم لە حەوشی کارگەدا دەستم بەسەرداگرتن، ئەو کاغەزانە لەوێ مانەوە، بەفری زۆریان لەسەر باری، خەڵکم لەگەڵ خۆم بردووە بەفرم لەسەریان پێ ماڵیون، چەند بە «کۆمەڵەی خوێندکارانی یەکێتی»م وت کە بێن هاوکاریم بکەن و بیانپشکنین و ئەو بەڵگەنامانە لە فەوتاندن ڕزگار بکەین، کەس بەدەنگمەوە نەهات.

دکتۆر مەحموود دەروێش نادر لە زانکۆ بوو، بە قوتابیانی پارتی وتبوو، ئەوانیش بۆ ماوەی دوو ڕۆژ پێنج کەسیان بۆ ناردم، وەختێ تەماشایان کرد ئەم کاغەزانە هی ئەمن و موخابەرات نین و بەڵگەنامەی سیاسیی نین، بینیم لەناو خۆیان ورتە ورتیان دەست پێکرد و ئەوانیش وازیان هێنا، بەڵگەنامە ئەوە نییە تەنیا لایەنی سیاسیی بگرێتەوە، دەبێ بزانرێ کە هەر دامودەزگایەکی حکومەت بەڵگەنامەی پڕ بایەخی خۆی هەیە، چونکە چالاکی ئەو دەزگایە

نیشان دەدات، ئەو دەزگایە چی کردبێ هەمووی لەو کاغەزانەدا دیارن، ئەمانە مێژووی دەزگاو بەڕێوەبەرو فەرمانبەرەکانێتی، ئەگەر دەزگایەک کاغەزی نەما وەک ئەوەیە پێشتر نەبووبێ، بەڵگەنامەکانی کشتوکاڵ (٦٥) فەردە بوون، زۆرم پێ گرنگ بوون، کە بریتی بوون لە «٦٤٥» ئیزبارەو لە «٥٣٠٩» دۆسیەم دەرهێنابوون، مێژووی دوورو درێژی کوردستان بوون سەبارەت بە کشتوکاڵ، دەکرا چەندین تێزی ماجستێرو دکتۆرای لەبارەوە ئامادە بکرێت، کە ئێستا هیچیان نەماون، ئەمانەش هەر لەسەردەمی پاشایەتی دەگرتەوە تا کۆماری و هەموویان بزر بوون، ئەوە کارەساتە بۆ سامانی بەڵگەنامەیی کورد، نزیکەی نیو ملیۆن بەڵگەنامەی «کەریمی عەلەکە» لە ماڵەکەیدا هەبوون، کرێچی خانووەکەی بەناوی «عەبدوڵلا عەزیز» کە چەندین جار پێم وت ئەم کاغەزانە بپارێزن، کەچی لە (١٩٨٥) هەمووی فرێدابوو تا هۆدەکەی گەچکاری بکات و بەکرێی بداتەوە، ئەو پیاوە هەشت کرێچی خستبووە ناو خانووەکەیەوە، ئیتر عرووسیە گەورەکەی و پەنجەرەکان کە ڕەنگاوڕەنگ و هونەریی بوون لە دەستکردی وەستا (مەحموودی عەولا سوور) بوو هەموویان شکاندو دارەکانیان بۆ خۆیان فرۆشت، تا ئەمڕۆش ئەو خانووە کەلەپوورییەی داگیرکردووەو چەند داوا دەکەم بیپارێزرێ کەس وەڵامم ناداتەوە.. ئەگەر یەک ملیۆن ساڵ تەمەنم بێ، بەڵگەنامەکانی عەبدولکەریمی عەلەکەی وەزیری دارایی شێخ مەحموودی نەمر لە بیر ناکەم، کە زۆر بەڵگەنامەی گرنگی بە کوردی و تورکی و فارسی و سریانی و عەرەبی و زۆر زمانی تر تێدابوو، ئەو پیاوە عەقڵیەتی بەڵگەنامەیی زۆر گەورەی هەبوو، ئەم عەبدولکەریمە حاتەمی زەمانی خۆی و خێرخوازێکی بەناوبانگ بووە، لە ساڵانی گرانی گیانی چەندین کەسی لە مردن ڕزگار کردووە، وەکیلی کۆمپانیایەکی فەرەنسی بووە، ئەملاکی زۆری کشتوکاڵی هەبووە، هەر نامەیەکی بۆ شوێنێ ناردبێ لە سجلەکانی خۆیدا تۆماری کردوون، ئەوانە هەر هەموویان فەوتان. کەلەپووری بەڵگەنامەیی کورد ئەگەر بەهێزێکی سیاسی و شۆڕشگێڕ نەبێ ناپارێزرێ.

* ئەی لەبارەی ئەوراقەکانی دادگا چیتان کردو چییان بەسەر هات؟

– لە ڕۆژی (١٤/٣/١٩٨٥) یەک لۆری ئەوراقی دادگا لیژنەی تەلەفکردن بردبووی لە چەمی قلیاسان بیانسووتێنێ، ڕێگەم لێگرتن و لێم وەرگرتنەوە، سەرۆکی لیژنە حاکم (ئیبراهیمی عەلی مامە شێخە)ی کوردپەروەر بوو،

کاغەزەکانی دامێ و وتی هەرچەندە بەرپرسیاریی تێدایە، بەڵام بۆ تۆ قەیدی نییە مادەم هێندە بەکاری و دڵسۆزانە کار دەکەی، ئەوراقەکانم خستە نێو ژێرزەمینی دائیرەی شوێنەوار، کەچی هەندێ لە پیاوە خراپەکانی ئەو دائیرەیە خۆیان گەیاندە دائیرەی ئەمن و مونەزەمەی بەعس و شکایەتیان لێکردم، بەڵام کاک (فارووق حەفید) کە پرسیاریان لێکردبوو، وتبووی عەبدولرەقیب و رۆشنبیرانی کورد داوای کردنەوەی دەزگای پاراستنی بەڵگەنامەکانیان کردووە، بۆیە ئەمانەی هێناوە. ئەو رۆژانە کاک فارووق بەشێوەیەکی کاتی لە جێگەی بەڕێوەبەری رۆشنبیری جەماوەر دانیشتبوو، لەمبارەیەوە رۆڵێکی باشی بینیبوو، ئەو ئەوراقانەم لەژێر زەمینی دائیرەی شوێنەوار پاراست، ئیتر نووسراوی رەسمیم لە پارێزگاوە بۆ بردن تا فڕێی نەدەن، ئەوانەش مانەوە تا لەم دواییە مەڵبەندێکی بەڵگەنامەیی دروست بوو.. کاتێ (جەمال عەبدول) کرایە وەزیری رۆشنبیری سلێمانی لە رۆژنامەی «ئاڵای ئازادی» نامەیەکم بۆ نووسی بەناوی «نامەی پیرۆزبایی و چەند پێشنیارێ بۆ وەزیری رۆشنبیری» یەک لەو پێشنیارانە مەسەلەی بەڵگەنامە بوو کە پێویستە بنکەیەکی بەڵگەنامەیی بۆ دروست بێ، کە بووە پارێزگاریش هەر بە یادیم دەهێنایەوە کە بۆ ئەم پرۆژەیە چی کردووە؟ بە کورتی کابرا هیچی نەکردو منی نائومێد کرد، تا برادەرێ لە سوێد هاتەوە ویستی شتێک دروست بکات و بەرە لەژێر پێی من دەربکەن، ئەو و هەندێکی دیکە و جەمال عەبدول کۆبوونەوەکیان کرد کە ئەویشیان وەک وەزیری رۆشنبیری بانگ نەکردبوو. ئەو برادەرە کەمترین کاری لەسەر بەڵگەنامە نەکردبوو تەنیا وەک یانەسیب فەردەیەک بەڵگەنامەی (محەمەد رەشید خان)ی کاتی کۆماری مەهابادی پێ درابوو، کە ئەوەشی بڵاوکردەوە کۆبوونەوەیان بۆ دروست کردنی بنکەی بەڵگەنامە پاراستن کردبوو، ئایا چۆن (وەزیری رۆشنبیری) ئەوکاتەی سلێمانی رازی بوو مەڵبەندی بەڵگەنامەیی لە ماڵان دروست ببێ نەک لە دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری، جگە لەوەی کە لەسەردەمی وەزیرێتی ئەودا لە دائیرەی ئاساری سلێمانی هەموو زێرەکانی دائیرەی ئاسار دزران، (عادل مەجید) کە بەڕێوەبەر بوو بەو تۆمەتە نزیکەی ساڵێک گیرا، پاشان (ئیفراج کرا نەک تەبرئە) دوایی بەرەڵڵا کراو جارێکی تر گیرایەوە و ئەمجارە لەسەر داوای جەمال عەبدول بەرەڵڵا کرا.
پاشان من ئەو مەسەلەیەم بە نووسراوێ گرێدا کە لەکاتی خۆیدا لە هەولێرەوە

پەنا براندەوە، تەنیا بۆ ئەوە بوو من دەورم تێیدا نەمێنێ.
که لیژنەی دروست کرد هەندێ بەڵگەنامەشیان سووتاندبوو، بێ ئەوەی بزانن ئەمانه چین و چی نین، گوایه بەکەڵک نایەن، چونکه نەیانزانیبوو فەحسیان بکەن که کامیان بەکەڵکەو کامیان بێ کەڵک، کاتێ لەبەردەمی وەزارەت خەریکی سووتاندنیان بوون تەماشا دەکەم کاغەزەکانی منن، وتم ئەمه بۆچی دەیانسووتێنن؟ گوتیان چەند کەسێ له ژوورەوە فەحسیان کردووە.
بەڵگەش بۆ ئەوە چەپکه بەیانێکی (فەهد)ی سکرتێری حزبی شیوعی بوو که به کوردی و به ئیمزای خۆی له بارەی مافی «گەلی کورد له عێراق »له ساڵی (١٩٤٦) نووسرابوون، ئەم بەڵگەنامەیه زۆر گرنگ بوو، کاتی خۆی نوسخەم لێدا به «ئەکرەمی ساڵحی ڕەشە» که به نهێنی بیانپارێزێ و ئەوەکەی تریم لەناو فەردەیەکدا شاردەوە. ئەم بەڵگەنامەیه بەلانی کەم پەنجا نوسخه دەبوو، دیاره که هەندێ کەس هێناویەتی بۆ سلێمانی و لێیان گیراوە، پاشان کەوتبووە ناو ئەوراقەکانی دادگا، زۆر مەراقمه ئەو بەڵگەنامه گرنگه بدۆزرێتەوە، چونکه هیچ ئاسارێکی ئەم بەیانەمان له ئەدەبیاتی کۆنی حزبی شیوعیدا نەدیوە، که بەڵگەنامەیەکی دەگمەن بوو و فەوتا. من ئەگەر بشمرم هەر پێوەندیم بەو ئەرشیفەوە هەیە. نەک بڵێن پێوەندی بەسەر ئەرشیفەوە نەما، چونکه بەقەدەر سەنگی کارەکانم لەلایەن کەسانی ناحەز بەکورد و مێژوو و کەلەپوورەکەی دژایەتی کراوم.
* هەوڵەکانت لەبواری کردنەوەی مەڵبەندێک بۆ پاراستنی بەڵگەنامه زۆرن، بۆ مێژوو باسی هەندێکیان بکەو بەچی گەیشت؟
- دیوانی سەرۆکایەتی کۆماری له ڕۆژی (١٩٨٦/٦/٢٨)دا نووسراوێکی ڕەسمیی به ژمارەی (٢٧٦٢٠) دەرکرد، بەپێی ئەو نووسراوە (المنشأة العامة للصناعات الورقية)ی سەرپشک کرد که له هەموو پارێزگایەک بەڵێندەر بگرێ بۆ گواستنەوەی ئەوراقی دامودەزگاکان بەناوی موخەلەفاتی وەرەقی تا کەڵکی لێ وەربگرن و بکرێنه کاغەزی نوێ، که له بواری کاری خۆیدا ئەمه بووە ڕێگه خۆشکردنی ڕەسمی بۆ لەناوبردنی دەیان ملیۆن بەڵگەنامه له سەرانسەری عێراقدا، لەهەر پارێزگایەک شوێنێکی به ناوی (مرکز المخلفات الورقية)

دەکردنەوەو دەیانبردنە کارگەی کاغەز دروست کردن لە بەسرە، (اتحاد الطلبة)ی عیراقی لەو ساڵەدا بەکاری هەرەوەزی ئەوراقیان لە دائیرەکان بۆ ئەو مەڵبەندە کۆ دەکردەوە و دەیانناردنە بەسرەو ئیتیحادییەکان لەسەر ئەوکارە خەڵاتیشیان پێ درا، ئەمە مەترسییەکی گەورە بوو لەسەر بەڵگەنامەکان، منیش لە ڕۆژی (١٩٨٧/١١/١٩) برووسکەیەکم بۆ دیوانی سەرۆکایەتی کۆماری ناردو نووسیم ئەم کارە هەڵەیەو دەبێتە هۆی لەناوبردنی زۆر بەڵگەنامە، وەک شکایەتیش لە دیوانی سەرۆکایەتی کۆماری لە ڕۆژی ١٩٨٨/١١/٢٤ نامەیەکم بۆ مەڵبەندی نیشتمانی بەڵگەنامە نووسی و وەزارەتی حوکمی محەلی- لیژنەی سەرەکی پاراستنی بەڵگەنامە. پاشان نامەیەکم بۆ هەندێ لایەنی دیکەش نووسی کە ئەو نووسراوەی دیوانی سەرۆکایەتی مەترسییەکی زۆری لەسەر بەڵگەنامە لە عێراقدا هەیە، ئەم هەموو برووسکەو نووسراوانە لەلام پارێزراون.

لە ڕۆژی (١٩٨٤/٨/٤) نامەیەکم بۆ ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان لە هەولێر نووسی، داوام لێکرد مەڵبەندێکی بەڵگەنامە پاراستن لە کوردستان دروست بکرێت تا چیتر بەڵگەنامە لەناو نەچن، ئەوانیش نووسراویان (لە (١٩٨٤/٨/١٥)/ ٦/١١١/ ٣٨٨٠) نووسی تێیدا پێشنیار کرابوو من بنێرنە بەغدا بۆ مەڵبەندی بەڵگەنامەکان تا هەرچی بەڵگەنامەیەک کە لەبارەی کوردستانەوە هەیە فۆتۆکۆپی بکەم و بیانهێنم، ئەنجامی ئەو کارەش دیار نەبوو.. بۆ زانکۆی سەلاحەدینیشم هەر نووسی کە مەڵبەندێک بۆ بەڵگەنامەکان دابنرێ، ئەو کاتە دکتۆر خەسرەو شاڵی سەرۆکی بوو، پەسەندی کردو ڕێنمایی بۆ دانرا، بەڵام ڕاپەڕینی بەسەردا هات.

لە (١٩٨٧/٧/٢٠) یاداشتێکی چەند لاپەڕەییم بۆ سەرۆکی ئەنجوومەنی ڕاپەڕاندن نووسی، دوایی لە (١٩٨٧/٧/١٩) لە سلێمانییەوە هاتمە هەولێر و لەگەڵ دکتۆر حوسامەدین نەقشبەندی چووینە لای، وتی یاداشتەکەتان لەبەردەستمە، زۆر شتی چاکە، ناوی (١٣ - ١٤)کەسم بۆ ئەو ئیشە نووسی، پاشان فەرمانەکەی بۆ ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان حەواڵە کرد، ئەویش زۆری پێ خۆش بوو، ناردییە لای بەشێک لە بەشەکانی دائیرەکەی، کە چەند جار لە سلێمانییەوە دەچوومە لای بەرپرسی ئەو بەشە هەمووجار

برووبیانووی دەهێنایەوەو ئیشەکەی نەدەکرد، ئەمیندار پیاوێکی باش بوو حەزی لێبوو کاری باش بکات، بەڵام ئیدارەکەی لاواز بوو، کۆمەڵێ پیاوخراپ و بازرگانی قەڵەمی لە دەور کۆببوونەوە کە ڕێگر بوون لە بەرانبەر زۆر نووسەری پاک و چاک وکاری خراپیان دژ بە نووسەران دەکرد. من ئەو کات لە سلێمانی نەمهێشت بەڵێندەر هیچ ئەوراقێ ببات و ئەوراقی ئەوێم پاراست، بەڵام هی هەولێرم پێ کۆنترۆڵ نەکرا، ئەمە بەشێ بوو لە هەوڵ و کۆششم بۆ بەرگری کردن لە سامانی بەڵگەنامەیی کوردستان..

درێژەی ئەمانەش لە یاداشتەکانمدایە، بێگومان خەڵکیش بەم هەولانەم نازانن، چونکە من چاوم لە خۆ دەرخستن و سنگ دەرپەڕاندن نەبووە، بۆیە لەسەر ئاستی ڕۆژنامەو گۆڤار ئەو لایەنانەم نەنووسیبوو، مرۆڤ چەند هەوڵ بدا بە پڕوپاگەندە خۆی بێنێتە پێش، ئەگەر لە حەقیقەتدا خۆی لەو ئاستەدا نەبێ هەر ڕۆژێ دێ وەک گوێزی پووچ دەمێنێتەوە.

من یەکەم کەس بووم بابەتی بەڵگەنامەم وەک سامانێکی کەلەپووریی کوردستان هێنایە ناو ڕۆشنبیریی کوردی، لە بەشێکی کتێبەکەمدا بەناوی **(بانگەوازێک بۆ ڕۆشنبیرانی کورد)** یەکەم بابەتە کە لە (١٩٨٥) چاپم کردووە، هەندێ کەس ئەم کتێبەم بە بەرنامەی ڕاستەقینەی ڕۆشنبیریی کوردی دەزانن، مەبەستم هوشیارکردنەوەی خەڵکی بوو، ئەوە بە بایەخترین بەرهەمی منە کە سانسۆر دابوویە دووکەس و لەسەری ڕازی نەبوون چاپ بکرێ، بۆیە لێم وەرگرتنەوەو دیسانەوە پێم دانەوە کەسی سێیەمیش لە ڕەقابە هەر ڕەفزی کردەوە، ئینجا خوالێخۆشبوو «شێخ ئەمین نەقشەبەندی کوڕی شێخ عەلائەدینی بیارە» کە مرۆڤێکی دڵسۆز بوو بۆ میللەتی کورد یارمەتیی دام، کتێبەکەی لە ڕەقابە وەرگرت و هێنایە ماڵی خۆی و ئەو خاڵانەی زۆر حەساس بوون سڕیمانەوە، خۆشم هەندێ شوێنم پیشان دا تا لە پاش چاپ کردنی بەرپرسیار نەبێ، کتێبەکەم چاپ بوو کە نیوەی خێرەکەی هی ڕەحمەتی شێخ ئەمینەو ١/٤ی خێرەکەی بۆ مامۆستا (سەعید دێوەچی)یە کە فێری نووسینی کردم و چارەکێکی بۆ منە. ئەگەر مەڵبەندێکی بەڵگەنامەیی لە کوردستاندا هەبوایە، نەیدەتوانی بەقەدەر من کار بکات و خزمەتکردنی بواری شوێنەواریش ئەگەر باس بکەم، لەوە کەمترم نەکردووە.

* ئایا بایەخ نەدان بە کەلەپوور و مێژوو بەشێکی بۆ ئەو شوێنکەوتەییە

(تەبەعییەتە) ناگەڕێتەوە کە لەلای ڕۆشنبیری کورد هەیە؟

– ملدان بۆ بەرهەمی بێگانە شتێکی خراپە، ئەمەش لەوەوە هاتووە کە کورد باوەڕی بەشتی خۆی نییەو بەلایەوە گرنگ نەبووە، چونکە فێری تەبەعییەت بووەو لاسایی بێگانە دەکاتەوە، ئەو هەستەش لە ئاکامی ژێردەستییەکی دوورو درێژی کوردستان پەیدا بووە، ئەو ژێردەستییە ئەمە ئاکامەکەیەتی، نموونەیەک لەسەر ئەمە دێنمەوە کە کورد بڕوای بە خۆی نییە، کەریم خانی زەند توانی ئێران داگیر بکات، مونافسی بەهێزی هەبوو، کە داگیری کرد نەیگوت من شاهەنشاهی ئێرانم، نازناوی شاهەنشاهی لەخۆی نەنا، بەڵکو نازناوی (وەکیل)ی بەسەر خۆیدا بڕی، یانی وەکیلی شاهەنشاه، لەکاتێکدا شاهەنشاهی ئێران هەر نەبوو، ئەمە لە ئاکامی ئەو لاوازییە بوو، بەڵام محەمەد ئاغای قاجاری تورکمان کە حوکمی لە بنەماڵەی زەند وەرگرت نازناوی (شاهنشای ئێران)ی لە خۆی نا، لاوازییەک لە هەوڵ و هیممەتی کورددا هەیە، ئەمە لەسەر کەسێتی ڕۆشنبیرانی کورد ڕەنگی داوەتەوە، هەندێک تەنیا خۆیان فێری چەند ناوێکی بێگانە کردووەو ناوەکان ڕیز دەکەن، یان لە چاوپێکەوتنی سەر تەلەفزیۆن یەکە یەکە باسیان دەکەن بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵک تا پێیان بڵێن ئەمانە ڕۆشنبیرییەکی قووڵیان هەیەو ڕۆشنبیریی کوردییان تێپەڕاندووەو گەیشتوونەتە ئاستێکی جیهانیی، لە کاتێکدا ئەگەر بیانجووڵێنی هیچ زانیارییان لە بارەی مێژوو و جوگرافیاو کولتوورو کەلەپوورو ئەدەبی کلاسی کوردییەوە نییە، کەچی خۆشیان بە ئەدیب ناسراون، ئەمانە خۆیان و خوێندەواران هەڵدەخەڵەتێنن، دووساڵ لەمەوبەر لە (چایخانەی شەعب) لە سلێمانی بەیانێک هەڵواسرابوو، تەماشا دەکەم دژی چەند ڕۆشنبیرێکی کوردە کە کۆڕێکیان گرتووە، لەو کۆڕەدا ئیدیعای فەلسەفەو فەیلەسووفایەتییان کردبوو، هەموو کۆڕەکەشیان لە کتێبەکانی بێگانە دزرابوو، لەوێش برادەرێ ڕەخنەی لێ گرتبوون کە ئەمانە خۆیان ئەو توانایەیان نییە، نووسەری ناسراو نین و بەرهەمیان نییە، چۆن خۆیان بەو فەلسەفە گەورەیەوە دەلکێنن؟

ئێمە بەتایبەت لەم قۆناغەدا پێویستمان بە ڕۆشنبیری نەتەوەیی هەیە، کەلەپووری کوردی پێ زیندوو بکەینەوە، چونکە شارستانییەت و مێژووی کورد پێویستی بەمە هەیە و کارکردن دەبێ بەپێی پێویست بێت، هەندێک جار

خەڵک دەڵێن تۆ بۆ نەچوویتە ئەشکەوتی هەزار مێرد، ئەوە لە سلێمانی لە بەرانبەرمانە؟ ئەشکەوتی هەزارمێرد پێویستی بە من نییە، زۆر لە شوێنەوارناسان چوونەتە ئەوێ و پشکنینیان تێدا کردووە، ئیتر من بۆ بچم ڕۆژێکی خۆمی لەسەر دانێم، بەڵام ئەو شوێنەوارەی نەدۆزراوەتەوە، یان کەوتۆتە بەرتێکدانی خەڵک، ئەوە پێویستی بە چوونی من هەیە تا بەرگری لێبکەم، وەک لەپێش ڕاپەڕین گەورەترین بەرگریم لە سامانی شارستانی کورد کرد.

* لە دوای ڕاپەڕین ڕۆژنامەگەری کوردی چەند توانیویانە خزمەتی مێژوو و کەلەپووری کورد بکەن؟

- ماوەیەکە گۆڤارەکان خوویان داوەتە مەلەف کردنەوە بۆ نووسەرە بیانییەکان و زیاتر لە (٥٠-٦٠) لاپەڕەیان لە بارەوە پڕ دەکەنەوە، ئایا ئەمە لە زیرەکایەتی زانستییەوەیە؟ یان ئەمە قەڵەمی بازرگانییەو نیشانەی نا ڕۆشنبیرییە؟ ئەو زانا بێگانەیە چ پێویستی بە من و بە تۆیە لە کاتێکدا سەدان وتاری لەسەر نووسرابێ، ئەوانە بۆ ناچن مەلەف بۆ ئەحمەدی خانی و خانای قوبادی و مەلای جزیری و پیرەمێرد بڵاو بکەنەوە؟ یان بۆ ناودارانی کورد مەلەف بکەنەوە؟ ئەمەش نەزعەیەکی بازرگانییە، پێویستە گۆڤارەکانمان ڕێگە بەم جۆرە کارانە نەدەن، چونکە ئەمانە وەرگێڕانیان کردۆتە بەڵاو دەردێ بۆ ڕۆشنبیری کوردی، ئەو هەموو گۆڤار و ڕۆژنامانە کە نیوەیان زیادن و هەمووی پڕ وەرگێڕانن. بۆ گۆڤارێ نییە بابەتەکانی تایبەت بە کورد بێ؟ با لە (١٥٪) بەرهەمی بێگانەمان هەبێ، ئەوەی دەکرێ کاری مرۆڤی سست و خاوە، مرۆڤێ حەزی لە ماندوو بوون نییەو لە بواری لێکۆڵینەوەو عەقڵییەتی زانستیدا ورد نییە.

* ئەی بۆ دەرباز بوون لەو سستییەی باسی دەکەیت چارە چییە؟

- یەک لە چارەکان بۆ ڕۆشنبیری کوردی هاندانی لێکۆڵینەوەیە، چونکە لێکۆڵینەوە مەشقی زەین و بیرتیژییە، مرۆڤ فێری وردەکاری و ماندووبوون دەکات، نووسینی لێکۆڵینەوە ڕێگەیەکە بۆ پێشکەوتنی ڕۆشنبیریی کوردیی کە بابەتی وەرگێڕان وەک نەخۆشی بەرەو دواوەی بردووە، لە پێش ڕاپەڕین حکومەت حەزی نەکردووە خەڵک فێری نووسینی لێکۆڵینەوە بێن و بیر لە ڕابردووی خۆیان بکەنەوە، چونکە یەک لە خەسڵەتەکانی سیاسەتی داگیرکاری

ئەوەیە کە وڵاتیٚ داگیر دەکات هەوڵ دەدات دیواریٚ لەنێوان میللەتی ژێر دەست و ڕابردووەکەی دروست بکات، تا حەز لە مێژوو و شوێنەواری شارستانی خۆی نەکات، چونکە ئەم بابەتانە دەبنە هۆی زیندووکردنەوەی بیری نەتەوایەتی و دژ بە داگیرکەر گیانی بەرگری بە بەری میللەتدا دەکات و ئەو میللەتە دەکەوێتە شۆڕش کردن، ڕابردوو هەستی شانازی لە دڵی مرۆڤدا دەخولقێنیٚ، ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان لەژێر دەستە ئەوانیش ئەو سیاسەتی داگیرکاریانە بەکاردێنن، ئەو داگیرکارانە میللەتانی ژێر دەست بە هەندیٚ بابەتی سست و خاو و کەم تەئسیر سەرقاڵ دەکەن، داگیرکەر ناهێڵێ ڕابردووت هەبیٚ، ئێمە پێویستە سامانی شارستانی خۆمان زیندوو بکەینەوە، وەک میللەتیٚ نین سەدان ساڵ، یان دەیان ساڵ دەوڵەت بین و کەلەپووری خۆمان زیندوو کردبێتەوەو هاتبینە سەر شتی بێگانە، هیچمان بۆ مێژوو و کەلەپووری کورد نەکردووە، ئەمە چەند ڕێگایەکە بۆ چارەسەرکردنی باری ڕۆشنبیریی کوردی تا بەرەو گەشەکردن بچیٚ.

گۆڤارو ڕۆژنامەش لە کوردستان زۆر بووە، باشە کوا ئەوەندە توانای زانستی لە کوردستان هەنە تا بتوانن ئەم هەموو گۆڤارانە پڕ بکەنەوە؟ ئەمە ئاستی گۆڤارەکان بەگشتی دادەبەزێنیٚ، چونکە هەر کەسیٚ دەستی قەڵەم بگریٚ دەتوانیٚ بە ئاسانی بەرهەمی خۆی تێدا بڵاو بکاتەوە، ئەگەر پێنج گۆڤاری باش هەبن لەسەد گۆڤاری لاواز باشترن، حەز دەکەم لێرەدا ئاماژە بە هەندیٚ گۆڤاری جوان بدەم لەوانە: گۆڤاری دهۆک کە شارەوانی دهۆک دەری دەکات، هەروەها گۆڤاری مەتین، ئەم دوو گۆڤارە لە جوانترین گۆڤارەکانی کوردستانن و نووسینی جوانیان تێدایە.

من کاک ئازاد عەبدولواحید دەناسم و پێکەوە لە مۆزەخانەی ئەتنۆگرافی لە سلێمانی فەرمانبەر بووین، حەزی لە شتی جوانە، گۆڤاری (ڕامان)یش لەناو گۆڤارەکانی تر ئاستی جوانترە، بەڵام پێم خۆشە لەوە باشتر بێت. ئەو هەموو گۆڤارەی کوردستان هەبوونیان زەرەرە بۆ بیری زانستی و عەقڵ و قەڵەمی پاک، بە پێویستی دەزانم ئەم گۆڤارانە کەم بکرێنەوە، هەر چەند کەسیٚ کۆدەبنەوەو گۆڤاریٚ دەردەکەن، بۆ ناوی خۆیان و پارە ڕاکێشان، لەبری نووسینی کوردی وەرگێڕان بووە بە دەردیٚ، لە جیاتی ئەوەی بێن کتێبیٚ لەسەر مێژووی کورد نووسرابیٚ وەری بگێڕن و هانی هەندیٚ کتێبی بە نرخ بدریٚ، بە

وەرگێڕانەوە خەریکن، واتە وەرگێڕانی ئەو بابەتانەی پێوەندییان بە کوردەوە نییە.

زۆر کەس لە منیان پرسیوە بۆچی وتارەکانی شەستەکان و چلەکانی گۆڤاری گەلاوێژ زۆر بەتامن، وتوومە چونکە لە دڵێکی سافەوە هەڵقوڵاون و بە کوردەوە گرێدراون، ئەگەر قسەکردن لە دڵی ساف و پاکەوە بێ زۆر کاریگەرە، شیعری شاعیرانی کۆن کە دەخوێنینەوە کارمان تێدەکەن، وەک شیعری (وەلی دێوانە) کە زۆر تەئسیر لە مرۆڤ دەکات، کەچی شیعرەکانی ئێستا چێژیان لێوەرناگیرێ، نووسین و بابەتی مێژووش هەروایە، هەندێ کەس بۆ ناوبانگی خۆیان کەوتوونەتە چەواشە کردن و بە ناوی مێژووەوە بابەت دەنووسن.

* بۆ چارەسەری هەڵە مێژووییەکانمان چی بکەین باشە؟

- پێویستە ئەمڕۆ بەپێی بەرنامەی لێتوێژینەوەی زانستی هەڵە مێژووییەکانمان ڕاست بکرێنەوە (ئەگەر هەبن) بە میزاجی خۆمان هەڵەو چەوتییەکان زیاتر نەکەین، لە نووسینی مێژوودا دەبێ سەلامەتی مێژوو بپارێزین و ڕێگە بە چەواشە کردن نەدرێ بە ئارەزووی خۆیان تەحریف بڵاوبکەنەوە.

بۆ نموونە کتێبی «دور الشعب الكوردي في ثورة العشرين»ی د. کەمال مەزهەر کە بزووتنەوەی کوردیانەی پێش (١٩٢٠) هەمووی کردووە بە بەشێک لە شۆڕشی ساڵی بیستی عەرەب. لە کاتێکدا لە پێش ساڵی (١٩٢٠) کۆمەڵێ بزاڤی کوردیی دروست بوون لە بانی بنووک لای شێخ فەرەج و لە ناوچەی سەنگاو لای شێخ مستەفای شێخ قادری گوللە نەبرو کەریمی فەتاح بەگ و ئاغایانی زەنگنەو عەشیرەتی ڕەباتی و لەلای سەید محەمەدی جەباری و ڕاپەڕینی ئیبراهیم خانی دەلۆ لە کفری کە شاری کفری ئازاد کردو بزاڤی گەورەی ڕەواندز تا نزیک هەولێریان ئازاد کرد تا لای قەمچووغەو پشدەرو ڕانیە ڕۆیشت، هەموو ئەم بزووتنەوانە بۆ ئەوە بوون ئینگلیز هەڵپێچن تا شێخی نەمر لە تاراوگە لە هیندستان بگێڕنەوە کوردستان و مافی کورد بدرێ.

لە کتێبی یاداشتی ئەحمەدی حەمە ئاغای پشدەریش ئەوەمان نووسیوە کە خۆی نوێنەری پشدەر بووە لە بزاڤی ڕەواندز و بە خەڵکی خۆی وتووە ئێمە هەر گوێمان لە شۆڕشی ساڵی بیست نەبووە، بەڵکو لە سلێمانی عەریزە دراوە و پولیشیان خستۆتە سەر مەزبەتەو چەند جارێک بۆ ئێمە هاتووە تا بە ناوی

بزاڤی ڕەواندز بیدەینە ئینگلیز بە مەبەستی ئەوەی شێخ مەحموود بگەڕێننەوە بۆ کوردستان و مافی کورد بدەن.
لەلاپەڕە (٤٠)ی کتێبەکەمدا (بانگەوازێک بۆ ڕووناکبیرانی کورد) ئەمەم وتووەو بە وردی باسی (حاجی عەولی ڕەبات)یم کردووە، نامیق حوسێن ئاغای هەمەوەندی کە لە ژاڵە بەشداریی کۆنگرەی عەشایرەکانی ناوچەی چەمچەماڵ و سەنگاو و گەرمیانی کردووە، لە بەهاری (١٩٢٠) لەم بارەوە لە ڕۆژی (١٩٨٤/٩/٢٠) هەروەها ڕۆژی (١٩٨٤/٦/١٦) چاوپێکەوتنم لەگەڵ حاجی عەول کردووە کە لە گەڕەکی (خەبات)ی سلێمانی بوو، تەمەنی ئەو کاتەی (١١٣) ساڵ بووە، ڕۆژی (١٩٨٧/١٠/٩) لە تەمەنی (١١٥-١١٧) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، حاجی عەول دەڵێ ئەو سەرۆک عەشیرەتانەی لە ئەنجوومەنی عەشایەر لە ژاڵە بەشداربوون، یەکەم کەس کە لە کۆبوونەوەکەدا قسەی کرد شێخ قادری گوللەنەبڕ بوو، پاشان شێخ مستەفای کوڕی قسەی کرد کە بەڕاستی هەردووکیان زۆر ئازاو بوێر بوون.
دوای ئەوان ئەشرەفی ڕەباتی قسەی کردووە، پاشان عوبەیدی ڕەباتی، دوایی عەبدولکەریمی حەمە ئاغای زەنگنەو کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەند و ئەمین ڕەشید ئاغای هەمەوەندو شێخ نەجمەدینی شێخ وەسمانی قەلاگە لە ناوچەی سەنگاو لەگەڵ شێخ محەمەدی برای، هەروەها ڕۆستەم ئاغای برای عەبدولکەریم ئاغای زەنگنەو حەمە خورشیدی حاجی شاسواری جافی میکائیلی و حەمە ساڵحی حاجی نادری جافی تیرەی ئالی وەیی و محەمەد ئەمینی کاک ئەحمەدی میکائیلی و تۆفیق ئەحمەد حارسی ڕەباتی کە ناوبانگی هەبوو بە شوەیلان ئاغاو کەریمی حەمە قادری ڕەباتی، بەڵام بەپێی زانیاری دیکە (سەید محەمەدی جەباری)شی تێدا بەشدار بووە.
حاجی عەول دەڵێ: ئەو کەسانەی کە لە کۆنگرەکەدا بەشدار بوون (٥٠٠) چەکدار بوون کە لەگەڵ ئەو سەرۆکانە هاتبوون، سوپای ئینگلیز کە هاتنە خوارەوە (٣٠٠) سەربازیان لێ بەدیل گیرا، یەک لەوانە ئەفسەرێک بوو کە گوللە بەر ملی کەوتبوو، من بە چاوی خۆم بینیم، پاشان هێزی ئینگلیز کە بەرەو کریچنە هاتن لەوانیش (١٠) کەسمان لێ بەدیل گرتن، پاشان زانیمان هێزێکی دیکە لە بەغداوە دێت، ئیتر ئەو هێزە لە شەڕدا سەرکەوتنی بەدەست هێناو شێخ قادری گوللەنەبڕ پەڕییەوە ئەوبەری سیروان، ئەشرەفی ڕەباتی و

حاجی عارفی ڕەباتی و عوبەید گیران و بردیانن بۆ قەرەهەنجیر، ئەشرەف لەوێ کە سەرەک عەشرەتی ڕەباتی بوو بەشەو ڕایکرد، حاجی عارفیش لە کەرکووک ڕایکردو لە خەستەخانە خۆی حەشار دابوو، لە خاوێ لە قەرەداغ لەلایەن ئینگلیزانەوە شێخ بابە عەلی و شێخ سەلام گیران، بەڵام شێخ عەبدولکەریم ئاغای زەنگنە لە هەردەی زەنگنە عاسی بوو و دایە کەژ و نەگیرا، ئەم ڕاپەڕینە فراوانە هەمووی بە ئینگلیز دانەمرکایەوە، بەڵکو سەید محەمەدی جەباری و کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەند لەسەر شەڕی پارتیزانی خۆیان بەردەوام بوون لە ناوچەی چەمچەماڵەوە تا طوزو کفری شەڕی زۆریان کردووە، ئەوە بوو لە (١٨)ی حوزەیرانی (١٩٢٢) کەریم بەگ دوو ئەفسەری ئینگلیزی لە پشت شاخی بازیان لە بەینی هەنجیرەو مورتکە کوشت، کە (بوند) و (ماکانت) بوون.

ئەم ڕاپەڕینە بەردەوام بوو، دوایی کەریم بەگ و سەید محەمەدی جەباری چوونە ڕەواندز، دوای بیست ڕۆژێ ئەو هێزەی ڕەواندز هات ڕانیەو کۆیەو قەمچووغەی لە سورداش ئازاد کرد، ئیتر ئینگلیزەکان سلێمانییان چۆڵ کردو ڕایانکرد و ناچار بوون لەژێر پاڵەپەستۆی ئەم ڕاپەڕینە شێخ مەحموود لە دیلێتی هیندستان بێننەوە کوردستان، ئەم زانیاریانەم بە دەنگی ئەوانە تۆمارکردووە کە بەشداریی شەڕەکان بوون. هێزێک لە چەمچەماڵەوە بەرەو سەنگاو هات، بەڵام کوردەکان ئەو هێزەی ئینگلیزیان شکاندو سەنگاو بە ڕزگارکراوی مایەوە..

(ئەدمۆندز)ی تاوانبار بە حەقی کورد لە (ل٢٦٨- ٢٧٢)ی کتێبەکەیدا (کوردو تورک و عەرەب) باسی ئەو ڕاپەڕینەی ڕەواندز دەکات کە لەژێر پاڵەپەستۆی ئەو ڕاپەڕینەدا شێخیان گەڕاندۆتەوە سلێمانی، ئەحمەد تەقی خۆی کتێبی لە بارەی ئەو ڕاپەڕینەوە داناوە، چونکە خۆی لەناویدا بووە، ئەگەر ئەو کتێبە نەبوایە زۆر زانیاری بزر دەبوون، ئەحمەدی حەمە ئاغاش لە یاداشتەکەیدا کە بیرەوەری ئەو زانیاری فراوان لەو بارەوە باس دەکات، لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە (١١٢) ساڵی (١٩٨٧) لێکۆڵینەوەیەکم بە ناونیشانی لە کەلەپووری بەڵگەنامەیی کورد بڵاوکردەوە، کە چەند بەڵگەنامەیەکم هێناوەو باسم کردوون، یەکێک لەوانە نامەیەکی ئۆزدەمیرە بۆ سەید محەمەدی جەباری، لەوێدا بە درێژی باسی چالاکییەکانی سەید

محەمەدی کردووە کە زۆر ئازابووە، بە داخەوە بەڵگەنامەکانی کەریم بەگ یەک تەنەکە نامە بووە لە دەوروبەری ساڵی (١٩٧٦) کوڕێکی هەبوو ناوی عەزیز بوو فڕێی دابوون و وتبووی ئەمانە کۆنن و بەکەڵک نایەن، من کە لە (١٩٨١-١٩٨٢) چوومە لای مام عەزیز وتی یەک تەنەکە بوو فڕێم دان، ئەوانەی نامەکانیان دیوە دەڵێن چەند کاغەزێکی مستەفا کەمالیشی تێدا بووە کە بۆی ناردبوو، ئینجا بەمنی وت خەتای من نییە، خەتای ئێوەیە کە تا ئێستا کەستان دیار نەبوون، گوناهی لەناوچوونیان لە ملی من نییە، بەڵکو لە ملی ئێوەیە، ئەگەر ئەو نامانە مابان، ئەوە زۆر زانیاری ئەو ماوەیەمان بۆ ڕوون دەبوویەوە، بۆیە کتێبی (دور الشعب الكردي في ثورة العشرين) چەواشەکردنی ئەم بزووتنە کوردیانەیە.

* زیاتر لە چ بوارێکدا مێژوو- شوێنەوار- بەڵگەنامە- کەلەپوور و تاد.. کارتان کردووە؟

- من لە بواری مێژوو و شوێنەوار و فۆلکلۆر و کەلەپووری نەتەوایەتی کارم کردووەو ناتوانم هیچ کامێکیان بەسەر لایەکی تردا زاڵ بکەم، لە بواری بەڵگەنامەو شوێنەوار هەردووکیان بە چالاکی کارم لەسەریان کردووە.

لە بارەی کەلەپووری پەرش و بڵاو زیاتر لە (٣٠٠) سەعات بیرەوەری پیرەمێردانم تۆمار کردووە، کە مێژوو و زانیاری یەکجار زۆرو فراوانیان تێدایە، تا لەگەڵ هەندێ کەس لە کوردستانی باکوورو ئێرانیش بیرەوەریم تۆمار کردووە، بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا بایەخدانم بە مێژوو لەچاو ئەو بوارانە کەمتر بووەتەوە، ئەگەر ئەو چەند ساڵە چالاکییەکانم لە بواری شوێنەوار بە مێژوو حیساب بکرێ کە بابەتەکانیشم (٨٥٪)ی چاپ نەبوون، ئەو کتێبانەی چاپم کردوون دیوانی کرمانجی کە لە ساڵی (١٩٧١) چاپ کراوە، هەروەها دەولەی دۆستەکی بە دوو بەرگ، بانگەوازێک بۆ ڕووناکبیرانی کورد، شوێنەوارەکانی نەوێ لە شاخی سورێن، تابلۆکانی شەرەفنامە کە لێکۆڵینەوەی بیست تابلۆی شەرەف خانی بتلیسی-یە لە یەکەم دەستنووسی شەرەفنامە کە بە دەستخەتی شەرەفخانە، ئێستا لە نامەخانەیەکدایە لە زانکۆی ئیکسفۆرد لەژێر ژمارەی (٣١٥)دا، ئەو لێکۆڵینەوەیە بە وردترین کاری خۆمی دەزانم، ئەوەی لەم جۆرە بابەتانە دەنووسێ پێویستی بە زانیارییە لەبارەی هونەری ئیسلامییەوە، لەوانە قوتابخانەکانی بەغداو سەلجووقی و تەیموری و سەفەوی

و عوسمانی، هەروەها دەبێ لە بارەی شوێنەوارو مێژوو زانیاری هەبێ، کە من بە هەموویانم بەراورد کردووە..

دوایی هیچ ئاماژەیەک لەسەر تابلۆکان نەبوو کە هی شەرەفخانە یان نا، ئیسپات کردنی ئەوە کارێکی زەحمەت بوو، هەندێ شتی دوو ملیمەتر ورد بوو و توانیم بیخوێنمەوە و شی بکەمەوە، زۆر زەحمەتم دی تا توانیم ئیسپاتی بکەم ئەمە کاری دەستی شەرەفخانە، تا بەرێز مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی نامەیەکی لە (١٩٩٩/٤/١٢) بۆ نووسیبووم دەڵێ: خوا دەزانێ ئەو وردەکارییەی تۆ لەبارەی تابلۆکان نیشانت داوە خودی نەققاشەکە بە خەیاڵیدا نەهاتووە، ئەمە لەوە دەچێ کە جارێکیان ئەبوونواس بەلای قوتابخانەیەکدا ڕادەبووری مامۆستایەک شرۆڤەی بەیتێکی ئەبوو نواسی دەکرد:

**الا فاسقني خمراً وقل لي هي الخمر**

**ولا تسقني سراً أذا أمكن الجهر**

مامۆستا بە قوتابیانی وتووە: ئەمە ئارەقە و ناوی بێنە، لەبەر ئەوەیە تا گوێچکەی لەزەت لە ناوهێنانی ببینێ، وتوویەتی بە دزییەوە مەیدەرە من تا ڕێگای ئاشکرا مومکینە، یانی عارەقەکە دانێ بەرچاوم، دەڵێ بۆ وای وتووە بۆ ئەوەی چاوەکەشی لەزەت لە عارەق ببینێ، ئیتر ئەبوونواس بۆی دەچێتە ژوورەوەو دەڵێ لەسەر ئەم وردەکارییە زۆر سوپاست دەکەم، بەڵام کاتێ من ئەم شیعرەم وتووە سەرخۆش بووم و هەر ئاگاشم لەم وردەکارییە نەبووە، من ستایشی خۆم ناکەم، کەم کەس هەیە بتوانێ خۆی لەم جۆرە بابەتە بدات و تێیدا سەرکەوێ..

* ئەگەر پێشتر هیچ نەکراوە، ئەی لەمڕۆکەدا ئەرکی لەپێشینەی ڕووناکبیرانی کورد چییە؟

– لە بواری مێژوو و کەلەپووردا هەندێ کار لە لایەن نووسەرانەوە ئەنجام دراون، بۆ نموونە گۆرانی و حەقایەتی کوردی و بەسەرهاتی کۆن کۆکراونەتەوە، بەڵام لە مەیدانی تۆمارکردنی بیرەوەری پیرەمێردان زۆر هاوارم کردو داوام لە نووسەرانی کورد کردو دەیان نامەم بۆ خەڵکانێکی ڕۆشنبیر نووسی، تا وام لێهات وەختێکی زۆرم بە نامەنووسین سەرف کردو کەسیان هیچیان نەکرد. ئەمەش سستی و خاوی خستە مەیدانەکەوە، بۆیە بەرانبەر فەوتاندنی زۆر شت گوناهبارن، لە مەیدانی بینا کەلەپوورییەکاندا خەڵکم زۆر هاندا ئەو بینا

کەلەپووریانە بپارێزن، تا ئەسڵی مێژوویی ئەو شارانە وەک خۆیان بمێنن.
هەندێ شاعیرو چیرۆکنووس هەموو دنیاکەیان دەفتەرێکی بچکۆلەو قەڵەم جافێ بووەو حەزیان لەکاری ئاسان بووە، شیعرو چیرۆکی خۆیان دەنووسی. کاری بە سوودیان بۆ میللەت نەکرد، ئەمانە دژایەتی کەلەپووری پەرش و بڵاوی کورد و شوێنەوارو مێژوویان دەکرد.
کتێبی (بانگەوازێک بۆ رووناکبیرانی کورد) رەخنەیە لەو تەوژمە، پاش راپەرین هیوامان زۆر بوو گۆڕانکاری لە بزاڤی رۆشنبیریی کوردی دروست ببێ و ئەو کەسانەی داردەستی حکومەت بوون بۆ جێبەجێ کردنی سیاسەتە رۆشنبیرییەکەی دوور بخرێنەوە، تا وەچەی نوێ پێش بخرێن کە لەکەدار نەبوون و گەندەڵی و تەفەسوخ لەناویان دروست نەبوو، بە داخەوە دیسان بە چاوی خۆمان بینیمان پیسەکان خرانە پێش و کەسانی باش و وەچەی نوێ خرانە دواوە، هەندێک دەڵێن لە دوای راپەرین رۆشنبیری کوردی بەرەو دواوە چووە، هیواداریین بیرێکی قووڵ لەو لایەنە بکرێتەوە.
خەڵک پێی وابوو دوای راپەرین قۆناغی سەرکەوتنی رۆشنبیریی کورد دەست پێدەکات کە پێویست بوو گۆڕانکاری بەسەردا بێت، گۆڕانکاریش لە کاتی سەرکەوتندا بە دوو شت دەکرێت: بە گۆڕینی یاسا و رێنمایی و بە گۆڕینی کەسانی خراپ کە دەبێ لابرێن، بەلای منیشەوە لابردنی ئەوانە لە یاساش گرنگترە، چونکە هەر چەندی یاسا تازە بکەیتەوە ئەگەر لە دامودەزگاکاندا کەسانی خراپ هەبن، ئەوە یاساو رێنماییە نوێیەکان جێگەیان نابێتەوە. بۆ گۆڕانکاری گرنگە قەڵەمی باش بێنە پێش و هی خراپ لەناو رۆشنبیری کوردیدا لابرێن، عەقڵییەتی زانستی بێتە پێش و عەقڵییەتی بازرگانی دوور بخرێتەوە، بابەتی زانستی بێتە پێش کە پێوەندی بە کوردەوە هەبێ..
کوردستان باشترین شوێنە بۆ نووسینەوەی مێژوو، لەبەر ئەوە دەبێ بۆ نووسینی ئەو مێژووە هانی خەڵک بدرێ، چونکە ئەو خەڵکە پێشتر گرنگیی بە زانیاری و هەواڵی مێژوویی خۆی نەداوە، بۆیە هوشیاریی لەو بارەوە زۆر کەمە، هەر برەو بە شتی بێگانەو شیعرو چیرۆک دراوە. کاتێ گۆڤارێکی وەک (رامان) لەو بوارەدا داوا لە نووسەران دەکات بابەتی مێژوویی و کەلەپووری بنووسن، بۆ گۆڤارەکانی تریش باشترە لەسەر خەڵک فەرزی بکەن بەرەو مێژوو

و نووسینی لێکۆڵینەوەی کوردی بچن.
ئەمە ڕێگایەکە بۆ چارەسەر کردنی ئەو گرفتەی پێش ڕاپەڕین حکومەت هانی خەڵکی دەدا لە ڕێی نووسینەوە بیری نەتەوەیی لە کوردستاندا قەتیس بمێنێ، ئێمەیش میللەتێکی دواکەوتووین و کولتوورو کەلەپووری ئێمە تۆزی لەسەر نیشتووەو بڵاونەکراوەتەوەو زۆری لێ فەوتاون.
ئێمە ناتوانین تەنانەت خۆمان لەگەڵ میللەتی عەرەبیش بەراورد بکەین کە (٢٤) دەوڵەتیان لە پشتەو سەدان توێژەری مەزنی تێدایە کە لە بوارەکانی کەلەپووری شارستانی عەرەبی دەنووسن و زانکۆو کتێبی زۆریان هەیە و تەرخانن بۆ ئەو بوارە گرنگە، ئەگەر شتی بێگانەشیان وەرگێڕا ئاساییە، ئیتر بۆ لاسایی لایەنی یەکەمیان نەکەینەوە، کە تایبەتە بە زیندووکردنەوەی کەلەپووری شارستانی؟ هەر بۆیە لە قۆناغی پێش ڕاپەڕین هەوڵ دەدرا ئەو هوشیارییە بڵاو نەبێتەوەو شوێنەوارەکان تێک بدرێن و کەس نەزانێ ئەمانە چین و بەڵگەنامە لەناو بچێ و ڕۆشنبیرانی کورد عەقڵیان پێ نەشکێ لە سووتاندن و لەناوچوون ڕزگاریان بکەن، ئەم هەموو ڕووداوانەی لە کوردستان ڕوویاندا وای لێهات کەس لەسەری نەنووسێت.
* ساغ کردنەوەی مێژوو کارێکی زەحمەتە، بەتایبەتی ئەگەر زانستییانە ئەنجام نەدرێ زیانی لە قازانج زیاتر دەبێ.. ئێوە چۆن لەمە تێدەگەن و ئەگەر نموونەتان لە دەستدابێ؟
- ئەگەر مێژوو بەم شێوەیە ساغ نەکرێتەوە، ئەوە دەبێتە هۆی چەواشە کردن و دووركەوتنەوە لە ئەمانەتی زانستی، بۆیە دەبێ چاودێری لەسەر کتێب هەبێ کاتێ بڵاودەکرێتەوە، ئەو کەسەی پێشکەشی دەکات پێویستە شارەزای مێژوو بێ و وریابێ، لەم دوو ساڵەدا سەبارەت بە موشیری حەمەی سلێمان د. کەمال مەزهەر زانیاری چەوت و هەڵەی بڵاوکردەوە کە لە دەربەندی بازیان پێش لەشکری ئینگلیزەکان کەوت و هێنانی و گەمارۆی شێخ مەحموودی نەمریان داو لە ڕۆژی (١٨)ی حوزەیرانی (١٩١٩) شێخیان دەستگیرکرد، بەڵام مەسەلەی موشیری حەمەی سلێمان مێژوونووسانی ئەو دەمەی وەک ئەحمەد خواجەو ڕەفیق حیلمی و ئەوانی تر ئەمەیان نووسیوە، تەنانەت لەناو خەڵکی چەمچەماڵیشدا باس دەکرێت، کەچی دکتۆر هاتووە داوای لێبوردن لە موشیر دەکات، گوایە وانییەو ئەمە تۆمەتە خراوەتە ئەستۆی، مەسەلەی ئەو پیاوە

شتێکه براوەتەوەو بووە بە (ضرب المثل).. من زانیاریم لە هەندێ کەس وەرگرتووە کە بەشداری شەڕی بازیان بوون لەوانە: «شێخ مەحموودی شێخ حەسەنی باراوی» کە خۆی بینیویەتی کاتێ شێخ یەخسیرکراوە و ئەمیش لەگەڵیدا دیل بووە و براوەتە ناوچەی عەزیزیە و خراوەتە ناو تەلبەندو شێخ مەحموود جنێوی بەم موشیرە داوە، ئەمە زیانی هەیە بۆ لایەنی زانستی و ئەوەی ئەو بابەتانە هەڵدەسەنگێنێ پێویستە پسپۆڕ و شارەزابێ.

تەحریفێکی تر مەسەلەی ڕاکردنی شێخ مەحموودی نەمرە لە کاتی بەرپابوونی شۆڕشی مایسی ساڵی (١٩٤١) لەکاتی جووڵانەوەکەی ڕەشید عالی گەیلانی، ئەم ڕاکردنە لە سندووقی ئۆتۆمبێلدا بووە، واتە بە نهێنی ڕایکردووە، دوایی لە گەرمیان تووشی شەڕ بووەو فەقێ حوسێن کە بە ئەسڵ سنەیی بووە لە خانەقین دانیشتووە و کەسێکی نزیکی شێخ بووە، شێخ بەدوایدا هەناردووە تا لەگەڵ محەی ساڵحەسوور بیرفێنن، ئەو زانیارییەشمان زۆر بە درێژی وەرگرتووە.. یادەوەرییەکانی فەقێ حوسێن وابزانم کاک ئیبراهیم باجەلان وەک خۆی بڵاوی کردەوە، کەمن کاغەزم بۆ ناردبوو بڵاوی بکاتەوە، ئەو یادەوەرییانەش لەلای کچەکەی بوو، ئەگەرچی دکتۆر ئەم حەقیقەتەشی بەرچاوکەوتووە، بەڵام هەر سوور بوو لەسەر ئەو بیروڕایەی خۆی.

* ئایا مێژوو بۆ ناوبانگی مێژوونووس دەنووسرێ، یان بۆ حەقیقەت؟

– من لە کتێبەکەمدا نووسیومە هەر کەسێ بە بەڵگەوە هەڵەیەکم بۆ ڕاست بکاتەوە، ئەوە من سوپاسنامەی بۆ ڕەوانە دەکەم، لەکاتی هەڵبژاردنی ساڵی (١٩٩٢)ی کوردستان هەندێ ڕۆژنامەنووسی ئوسترالی هاتبوون بۆ هەواڵی هەڵبژاردن، شەوێک کاک (شێرزاد حەسەن)ی چیرۆکنووس پێی وتم هەندێ زانیارییان لە بارەی ڕەچەڵەک و بنەچەی کوردەوە پێ بدە، چونکە لەم بوارەدا داوای زانیارییان کردووە، کە چووم لە ماڵی (کەمال یامولکی) بوون شەو درەنگ بوو، زیاتر لە (٢٥) دەقیقە لەسەر ئەسڵی کورد قسەم بۆ کردن، ئینجا یەکێکیان وتی کورد ئەم مێژووەی هەیە بۆچی تائێستا نەبووە بە دەوڵەت؟ من لەبەر سۆزی نەتەوایەتی ڕاستیم نەوت و هێنامەوە سەر هۆکارە دەرەکییەکان، کە لە ڕاستیدا هۆکاری هەرە گەورە دووبەرەکی کوردە بە درێژایی مێژوو کە نەبووە بە دەوڵەت، دوای سێ ساڵ چوومەوە لای کاک (کەمال یامولکی) تا ناوونیشانی ئەو وەفدە ڕۆژنامەوانییەم بداتێ کاغەزیان بۆ ڕەوانە بکەم و

بنووسم من هۆکاری سەرەکی دروست نەبوونی دەوڵەتی کوردیم لێ شاردبوونەوە کە لەدوو ڕێگەوە کاغەزم بۆ ناردن و داوای لێبووردنم لێیان کرد، هەڵەیەکی تریشم لە کتێبی دەولەی دۆستەکیدا کردبوو، ئەویش هەر بەهۆی سۆزی نەتەوایەتییەوە بوو، کاتێ (پادی کوڕی دۆستەک) لە شاری باجلی سەرکەوت و کەوتە دوای بووەیهیییەکان و عەباسییەکان تا مووسڵی لە دەستیان دەرکردو مووسڵیشی داگیرکرد.. وەک هەندێ لە مێژوونووسان نووسیویانە دیلەکانیان کوشتووە، من ئەمەم لەو کتێبەدا شاردەوەو هەڵەیەکی مێژوویی‌یم کرد، دوایی هەڵەی خۆم ڕاست کردەوە، چونکە مێژوونووس نابێ لەژێر کاریگەریی عاتیفەی خۆی بنووسێ، کاتێ کتێبی نووسەرێک دەخوێنمەوە بەلامەوە گرنگ نییە دانەرەکەی ببینم و بزانم پانی و درێژی چەندە، لەوانەیە دانەرەکەی مردبێ، بەڵام زیرەکی نامرێ، هەندێ مێژوونووس هەن پێ لەسەر هەڵەی خۆیان دادەگرن، هەروەک نیازیان لە نووسینی مێژوو زاتی خۆیان و ناوبانگی خۆیان بێ، کە ئەمەش تاوانە بەرامبەر بە حەقیقەت و ڕاستی. ئەم عەقڵییەتە نازانستییە لە زۆربەی وڵاتانی دواکەوتوو لە ئاکامی دۆگما جموودی فکرییەوە هەیەو لە برەودایە، پێویستە ئەمە نەمێنێ، بۆیە تا میللەت بیری زانستی پێشکەوتووی لەلا دروست نەبێ، ئەوە لە شێوان و چەواشەکاری و شتی زاتی ڕزگاری نابێ.

* لەم ڕووەوە ڕێنماییت بۆ نووسەران، بەتایبەتیش نووسەرە لاوەکان چییە؟

- پاراستنی ئەمانەتی زانستی زۆر گرنگە، ون بوونی ئەمانەت زیان بە بەرهەمی ئەو نووسەرە دەگەیەنێ، داوا و تکا دەکەم ڕۆشنبیرانی کورد تا ئەمین بن زیاتر کتێبەکەیان بەهێزتر دەبێ. لە خوێندنەوەو نووسینیشدا قۆناغی هەرزەکاری هەیە، کە یەکێ تازە دەست بە نووسین دەکات، خۆی بەشتێکی گەورە دەزانێ، وا دەزانێ هەر خۆی نووسەرە، لای خۆی ئەو بڕوایە هەیە ئەگەر ئاماژە بەسەرچاوە نەدات، پێی وایە بەزیرەک دەناسرێ، لەو قۆناغی هەرزەکارییەی نووسیندا زۆر تووشی ئەم جۆرە لە خۆڕازی بوونە دەبێ، ئەم بۆچوونە بەسەر ئێمەشدا هاتووە، ئەوکاتەی بۆ یەکەمین جار شتم نووسی خۆم لە ئێستا بە گەورەتر دەزانی، بە مامۆستا (سەعید دیوەچی)م وت کەی دەتوانم کتێبێک چاپ بکەم، وام دەزانی چاوی هەموو خەڵک لەسەر کتێبەکەی منە، وتی ئەگەر (٥)ساڵی دیکە یەکەم کتێبت چاپ بکەی گەلەک باشە، من لام

وابوو ئەوە ماوەیەکی زۆرە، بەڵام دوایی (١٠)ساڵیش زیاتر تێپەڕی، ئینجا کتێبێکم چاپ کرد.. جا زۆر کەس هەیە لە قۆناغی هەرزەکاری نووسەرایەتی خۆیدا تووشی ئەم هەڵەیە دەبێت.

* هەن دان بە کۆشش و تەقەللای پێش خۆیان دانانێن و ئاماژە بە نووسینیان نادەن بۆ ئەوە چی دەڵێن؟

- هەن وتار بڵاودەکەنەوە، کەچی ئاماژە بەو کەسانە ناکەن کە پێش ئەوان لەو بوارەدا بابەتیان نووسیوە، یان ئاماژە بە سەرچاوەکان نادەن و وادەزانن ئەوەیان بەسەردا تێدەپەڕێ.. مومکینە خاوەنی ئەو نووسینە پێ بزانێ و وەڵامی بداتەوە، بۆ نموونە ساڵێ لەمەوبەر شتێکم لەبارەی (کەمبەرلاند)ەوە نووسی کە بەڵگەنامەیەکی گرنگم لەبارەی چۆنێتی کوشتنەوەی بڵاوکردەوە کە یەکێک لە خەڵکی دهۆک بۆ ماجید مستەفای وەزیری سەردەمی دەوڵەتی عێراقی ناردووە، ئەم پیاوە کە هاوچەرخی شۆڕشی کورد بووە دوایی بووەتە موتەسەریف و پاشان وەزیر، لەبارەی کەمبەرلاندی ئەمەریکی کە لەلایەن سەلیمێ مستێ-یەوە کوژراوە، ئەو بەڵگەنامەیەم بۆ یەکەمجار بڵاوکردەوەو ئەوەم ئیسپات کرد (مەکی شەریەتی) کە قائیمقامی حکوومەت بوو، ئەو هانی دابوو بیکوژێ و یەکەم جار بە حەمیدی برای (عەدۆ)ی نووسەری نامەکەی وتووە، بەڵام ئەو نەیکوشتووە، دواجار بە سەلیمی وتووە ئەویش قەناعەتی کردووە. دوایی لەبەر سۆزی ئایینی برادەرێ هات وتارێکی تری لەم بارەیەوە نووسی و وتارەکەی منی بە نووسینێکی کەم بەها پێشاندا. جا من دەپرسم کە ئەو خەڵکی دهۆکە ئەو هەموو ساڵە بۆچی زانیاری کۆ نەکردەوە؟ ئینجا کە ئەوەم نووسی و بۆ یەکەمجار ئەو بەڵگەنامەیەم بڵاو کردەوە، لای وابوو ئەگەر ڕەخنە لەمن بگرێ زۆر پێی گەورە دەبێ، ئەم عەقڵییەتە زۆر هەڵەیەو دوامان دەخات، دەبوایە بڵێ فلان کەس لەپێش من ئەم بابەتەی نووسیوە، من زیاتر ڕووناکی دەخەمە سەر ئەو بابەتە، ئەوە لە کاتێکدا نووسینەکەشی شتێکی گرنگ نەبوو.

لە گۆڤاری- دهۆک- ساڵی (١٩٩٨) برادەرێک بەناوی (محەمەد عەبدوڵڵا ئامێدی) وتارێکی لەبارەی- ئامێدی- نووسیوە و دەڵێ خەڵکی دەڤەر وتوویانە ئەمە پەرستگایە یانی (کورا سرێجی). تەها باقرو فوئاد سەفەر کە دوو گەورەترین شوێنەوارناسی عیراق بوون لە کتێبی (المرشد الى مواقع الآثار

والحـــضـــارة) دەڵێن ئەمە نازانین چییەو هی چ زەمانێکە، باشە ئەگەر ئەم شوێنەوارناسە گەورانە نەیزانن چۆن خەڵکی دەڤەر دەیزانن کە ئەوە پەرستگایە، دەبوایە بلێ عەبدولڕەقیب یووسف چەندین جار لە تەلەفزیۆنی دهۆک و لە نووسینەکانیدا وەک لە کتێبەکەیدا (شوێنەوارەکانی نەوێ لە شاخی سورێن) باسی کردووە، ئینجا ئەو شوێنەوارناسانە کە ئەوە نازانن، چۆن خەڵکی نەخوێندەوار دەزانن ئەمە پەرستگایە؟

با لەم جۆرە نا ئەمانەتی زانستییە دوور بکەوینەوە، چونکە ئەمەش پێوەندیی بە قۆناغی هەرزەکاری نووسینەوە هەیە، ئاماژەدان بە سەرچاوە نیشانەی زانستی خاوەن وتارو کتێبە و نابێتە نیشانەی لاوازی، تا زیاتر ئاماژە بەسەرچاوە بدرێ وتارەکە لە ڕووی زانستییەوە پتەوتر دەبێ، من تەنانەت کەڵکم لە پیرێژنێک یان منداڵێک وەرگرتبێ ئاماژەم پێیان داوە، ئەگەر لە کورتە نووسینێکدا لەبیرم چووبێ، ئەوە لە نووسینی درێژتردا باسم کردووە.

ئاماژەدان بەو خەڵکەی یارمەتییان داویت و زانیاریت لێیان وەرگرتووە، نیشانەی زانایی تۆیە، ئەکرەمی ساڵحی ڕەشە لە دووبەرگی کتێبی (شاری سلێمانی) خزمەتی گەورەی ئەو شارەی کرد، بەڵام ئەو ڕۆژەی من هانم دا کتێب بنووسێ، ئەو دەیوت نازانم بنووسم..!

پێم وت ڕێنماییت دەکەم، زۆر زانیاریم پێدا و زۆر کەس وای دەزانی ئەو کتێبە لە نێوان من و ئەودا هاوبەشە، کتێبەکەی چەندین ڕەسمی منی تێدایە و نوسخەی دووەمی بەکاربۆن لەلای منە، چەندم پێ وت لەهەر پیرەمێردێ زانیاری وەردەگریت ناوی بهێنە، کە کتێب دەرچوو تەماشا دەکەم بە هیچ شێوەیەک ئاماژەی بەو هەموو وێنە و زانیاری و ڕێنماییانەی من نەداوە و تەنانەت یەک جاریش ناوی منی تێدا نەنووسیبوو، پاش ئەوەی گلەییم لێ کرد، ئینجا لە بەرگی دووەمدا نووسی بە ڕێنمایی فلان کەس نووسیومە، ئومێدەوارم نووسەرانی تر خۆیان لەم ڕێبازە چەوتە بپارێزن و لەسەر خۆیان ڕەخنەگر بن.

کەسێ ڕەنجی غەیری خۆی ون بکات، بێگومان ئەوە هەر ئاشکرا دەبێ، ئێستا ئێمە هەڵەی مێژوونووسێ دەدۆزینەوە کە هەزار ساڵ لەمەوبەر شتێکی نووسیوە، توێژەرەوان تەعقیب دەکەن و دەڵێن بۆچی فلان مێژوونووس هەزار

ساڵ پێش ئێستا ئەم قسەیەی وتووەو ئەمەی نەوتووە؟ یان نیازی لەوە چی بووە؟

جاری وا هەیە نووسینەکە دەبرێتە سەر نیازێکی ناشەرعی، هیچ شتێ لەبەردەستی مرۆڤ قوتار نابێ، ئێستا پێی نەزانرێ دوای هەزار ساڵی تر دەزانرێ، هەمیشە مێژوونووس دەبێ بە ترس بێ لە لێتوێژەرەوەکانی داهاتوو، کێ دەڵێ دوای ملیۆن ساڵی تر ئەم شارستانیەتە وا بروات ئامێرێک پەیدا نابێ هەڵەی هەموو مێژوونووسان ئاشکرا ناکات؟ زانست هەموو سنوورەکان دەبرێت کە هەرگیز خەیاڵ پەی پێ نابات، دەبێ تەنانەت حیسابی مێژوونووس بۆ ملیۆن ساڵی داهاتووش بێ، تا گومان لەلای مێژوونووس هەبێ زانیارییەکانی پتەوتر دەبن، چونکە گومان لە کاری لێکۆڵینەوەدا کلیلێکە بۆ گەیشتن بە حەقیقەت وەک (غەزالی) وتوویەتی، هەروەها (ئیبن خەلدوون)ی بیرمەندی گەورەی ئیسلام دەڵێ: **«نابێ مێژوونووس متمانەی بە مێژوونووسانی پێش خۆی هەبێ، دەبێ هەمیشە بە گومان قسەیان لێوەربگرێ و لێی بکۆڵێتەوە، تا بزانێ راستە، یان راست نییە، بەمە رەنگە زۆر هەڵەی مێژوونووسان بدۆزێتەوە»** ئەمە مەنهەجی توێژینەوەی مێژووە کە لە پێشەکییەکەی ئیبن خەلدوون (مقدمة ابن خلدون) بەشێکی بۆ تەرخان کراوەو یەکێکە لە رێگەکانی دۆزینەوەی هەڵەی مێژوونووسان، تا ئەگەر هەڵەیان هەبێ دوای هەڵەیان نەکەوێت..

توانای مرۆڤ لەسەر توێژینەوەو لێکۆڵینەوە ئەوە نییە هەر کەموکوڕی خەڵکی پیشان بدات، یان تەنیا لە سەرچاوەوە شت رابگوێزێ، مەرجەکانی باسکار زۆرن، ئاماژە بە کتێبی «منهج البحث الأدبي» دەدەم کە هی زانای گەورە، خوالێخۆشبوو (د. علي جواد الطاهر)ە کە گەورەترین زانای بەرنامەی توێژینەوەی زانستیی بووە لە عێراقدا و قوتابی زانای گەورە (مستەفا جەواد) بوو، لە فەسڵی دووەمی کتێبەکەیدا بەناوی (الباحث) لاپەڕە (٣٨) نووسیویەتی لێتوێژەر چۆنەو دەبێ چۆن لێکۆڵینەوە بنووسێ و تا ئەنجامی کۆتایی چۆن زانیاری وەربگرێت.

* ئەی ئەو مەرجانەی پێویستن لە باسکاردا هەبن چین؟

- مەرجەکان و سیفاتەکانی باسکار ئەوەیە پێش هەر شتێ ئارەزووی لەسەر لێکۆڵینەوەو وردەکاری هەبێ، ئارامی و پشوو درێژی و تەحەمولی هەبێ،

ئەگەر ئەمەی تێدا نەبێ نابێتە لێتوێژەر، هەروەها گومانی هەبێ، ئەمە هۆکارێکە بۆ گەیشتن بە حەقیقەت. دوای ئەوە دەبێ لێتوێژەر لە ڕاگوێزان و وەرگرتنی زانیاریدا ئەمین بێ و ویژدانی هەبێ و ڕەنجی غەیری خۆی بزر نەکات، ئەگەر کەسێ لەبارەی بابەتێکی نووسی، دووەم کە هات ئاماژەی پێ بدات کە پێش خۆی کەسانی دی لەو بارەیەوە نووسیویانەو بەدوای ئەو بابەتەدا گەڕاون، سێیەم هات دەبێ ئاماژە بە یەکەم و دووەمیش بدات، ئەگەر زۆر کەسی تر ئەو بابەتەیان تەعقیب کردبێ و ئەم لەدوای هەموویانەوە هاتبێ، دەتوانێ ئاماژە نەدات و بەپێی بڕوای خۆی تەئویل بکات و خەتاباریش نابێ، مەرجێکی تری بەردەوام بوون لەسەر نووسینی لێکۆڵینەوە ئەوەیە زمانی زانستی بەکاربێنێ، لەفز لە مانا گەورەتر نەبێ، بە لەفزی بریقەدارو وشەی عاتیفی زل زل خوێنەر نەخەڵەتێنێ، تەنیا لە پێناوی قەناعەت پێهێنان وشە بەکاربێنێ، لە مێژوو نووسیندا دەبێ بەپێی قەبارەی مانا لەفز دابنرێ، لێرەدا زمانی زانستیی زمانێکی وشکە، ئەدەبی نییە، شیعروچیرۆک نییە خەڵک ڕاکێشێ و لە ڕێگەی عاتیفەوە کاریگەریی بەسەریانەوە بەجێ بهێڵێ، نووسینی بابەتی زانستی بۆ چێژ وەرگرتن نییە، پێڕەوکردنی شێوازی ئەدەبی لە نووسینی مێژوودا هەڵەیەو دەبێتە ڕەخنە لەسەر خاوەنەکەی، هەندێ کەس ئەم شێوازە بۆ ڕاکێشانی خوێندەوار پەیڕەو دەکەن، زانست بۆ چێژ لێ وەرگرتن نییە، بۆ ئەوەیە حەقیقەتی پێ بخەیتە ڕوو، بەشێوەیەکی بابەتیی بنووسرێ، هەروەها سیفەتێکی دیکەی لێتوێژەرەوە جورئەت و بوێرییە بۆ ڕەخنەگرتن، ڕەنگە قوتابییەکی ماجستێر، یان دکتۆرا هەڵە لە مامۆستای خۆی بدۆزێتەوە، دەبێ جورئەتی هەبێ ڕەخنەی لێ بگرێ تەنانەت ئەگەر لەسەر حیسابی دواڕۆژی خۆیشی بێ، نەک لە مامۆستاکەی بترسێ کە لە هەڵسەنگاندنی تێزەکەیدا ڕای خراپ بدات و نمرەی کەمتری بداتێ، زانیاری ڕاست و حەقیقەت لەبەرخاتری خەڵک و دڵی خزم و کەسوکار بزر نەکات، مێژوونووس لەوانەیە گلەیی زۆری بێتە سەرو تووشی ئازاردان بێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە ڕاستی بنووسێت. لێتوێژینەوە وردەکارییە وەک (د. عەلی جەواد) دەڵێ تامویۆیەکی تایبەتییە، دەڵێ لەوانەیە (٣٠) قوتابی لەسەر بابەتێ بنووسن و هەموویان بگەنە دەرەنجامی باش و لێتوێژینەوەی هەموانیش مەقبوول بێ، بەڵام لەوانەیە تەنیا یەکێک لەناویاندا سیفەتی لێتوێژەرەوە وەربگرێ و

کەسایەتییەکەی لە نووسینەکەیدا بەدەردەکەوێ، ئەو مەرجانەی پێویستن لە لێتوێژەرەوەدا هەبن زۆر زەحمەتە کۆ بکرێنەوە.
لە بەرگی یەکەمی کتێبەکەم «الدولة الدوستکیة» لە دوا لاپەڕەدا نووسیومە «أستدراکات و أخطاء المؤلف» ئەو هەڵانەی خۆم لەکاتی نووسین و هەڵەچنی لە نووسینەکەمدا کردبووم لەوێدا نووسیومە، دەمتوانی وشەی (أخطاء) نەنووسم، بەڵام بەدەستی ئەنقەست نووسیومە، یان دەمتوانی لە خوێندەوار ئاشکرای نەکەم و هەر نەینووسم، بەڵام لۆمەوگلەییم لەخۆم کرد
* ئایا پێشەکی نووسین بۆ کتێب کارێکی زانستییە، یان نا؟
- ئەم مەسەلەیە شتێکی زیاتر پڕوپاگەندەییە، چونکە یەکێکی بچووک دەچێتە لای یەکێکی گەورە، داوا دەکات پێشەکی بۆ کتێبەکەی بنووسێ و لەوانەیە بەستایش کردن تووشی لەخۆبایی بوون بێت. ڕەواج پەیداکردن بۆ کتێب دەبێ بە ناوەڕۆکی دەوڵەمەندو شێوازی زانستی خۆی و بەپێی ڕێکەوتنی لەگەڵ بەرنامەی لێکۆڵینەوەی زانستی پێش بکەوێ، نەک بەهۆی کەسێکی تر کە بێت چەند دێڕێکی بۆ بنووسێ و بڵێ کتێبێکی باشەو ستایشی بکات، خۆ ئەگەر بزانێ ستایشی کتێبەکەی ناکات، ئەوە هەر نایبات پێشەکی بۆ بنووسێ، مانای وایە کابرا خۆی بۆ پڕوپاگەندە کردن دەگەڕێ، من کە بەرگی یەکەمی کتێبی «الدولة الدوستکیة في کردستان الوسطی»م نووسی زۆرم لە مامۆستا عەلائەدین سەجادی کرد پێشەکیم بۆ بنووسێت، دیارە ئەوە لەو کاتەدا نیشانەی لاوازیی زانستیی من بوو، مامۆستاش پێی وتم: «من پێشەکیم بۆ کەس نەنووسیوە» بە مەرجێ زۆر منیشی خۆش دەویست، وازم نەهێناو پاشان نووسی، بەڵام پەشیمانیش بووەوە، منیش ئەو نووسینەی مامۆستام زۆر لەلا پیرۆزە، ئێستا منیش پەشیمانم کە ئەوەم کردووە، لە ژیانی نووسینمدا چەندین کەس داوای پێشەکی نووسینی لەمن کردووە، بەڵام نەمنووسیوە، هەندێ کەس داوای کردووە هەر کتێبەکەی پێشکەشی من بکات، بەڵام من ڕازی نەبووم، وتوومە پێشکەشی یەکێکی بکە کە موعجەب بی پێی و بە پاکی مردبێ، ئێستا کە پێشکەشی منی دەکەی کێ ناڵێ چەند ساڵێکی تر لە شێوازی زانستی یان لە هەندێ ڕەوشتی خۆم لانادەم و تۆ پەشیمان نابیتەوە.
لە بارەی پێشەکی نووسینەوە نامەم بۆ دکتۆر عەلی جەواد نووسی و ئەم

بیرورِایەم تێدا عەرز کردبوو کە لەوانەیە ئەم بیرۆکەیە لە خۆرئاواوە هاتبێ و پاشان میسرییەکان لاساییان کردبێتەوەو لە ولاتانی رۆژهەلات بلاوبووبێتەوە.. ئەویش لە نامەکەیدا بۆی نووسیوم: تۆ ڕاست دەکەیت ئەمە شێوەیەکە لە شێوەکانی پڕوپاگەندە، هەندێک زۆر عاشق بە پێشەکی نووسین، دەچن داوا لە خەڵک دەکەن تا پێشەکییان بۆ بنووسن، (د. عەلی جەواد) دەڵێ: **پێشەکی نووس دەلاڵە، دەلالی بۆ کتێبی خەڵک دەکات، پێشەکی نووسین پڕوپاگەندەیە و کارێکی زانستی نییە.**

* ئەی لە ڕووی زانستییەوە لەسەر بەرگی کتێب چی دەنووسرێ؟

– وەک لە بەرنامەی لێتوژینەوەی زانستی باوە ناوی دانەر دەنووسرێ، ئینجا ئەگەر یەکێک بێ یان لیژنەیەک بن، چەندین کتێبمان هەیە زۆر ناو لەسەر بەرگەکەی ڕیزکراوە، بۆ نموونە نووسراوە فلان کەس پێیدا چۆتەوە، فلان کەس هاوکاری کردووە، فلان کەس دایڕشتووەتەوەو ناوی چەندین کەسی تر لەگەڵ ناوی دانەر نووسراوە، ئەمە کارێکی زانستی نییە، دەتوانرێ لە پێشەکی خاوەنی کتێبەکەدا باسی ئەو کەسانە بکرێ کە لایەنی زمانی چاک کردووە یان ڕێنمایی پێ داوە.. تاد

هەموو ئەم شتانە لە پێشەکیدا نەک لەسەر بەرگی پێشەوە، یان لەسەر پشتی کتێب دەنووسرێن، ئەگەر دەستنووسێکی ساغ کردەوە دەنووسرێ فلان کەس ساغی کردووەتەوە، یەک بێ یان زیاتر ناویان دەنووسرێ، چونکە ئەو دەستنووسەیان ساغ کردووەتەوە، یان لەسەر کتێب دەنووسرێ کتێبی فلان کەس، یارمەتیدانی فلان و فیسار پێویست ناکات لەسەر بەرگ بنووسرێت.

هەن کتێبێکی چاک دەنووسن، بەلام پێش خستنە بازاڕی پێناسەی دەکەن و لەبەردەمی کتێبخانەکان کۆمەڵێ ستایشی لە بارەیەوە دەنووسن، ئەگەر کتێبەکە چاکیش بێ، ئەوە ئەم شێوازە بازرگانییە بۆ دانەرەکە و بۆ کتێبەکەی لایەق نییە و پێویستە خۆمانی لێ بپارێزین.

* لایەنی سۆزداری چەند کاری نەگەتیڤی بەسەر لێتوێژینەوەوە هەیە؟

– سۆزی نەتەوایەتی هۆکارە بۆ ئەوەی هەڵە بکەوێتە ناو نووسینەکانەوە، زۆر زەحمەتە ئێمەیش وەک بێگانە تەماشای مێژووی خۆمان بکەین و بینووسین، چونکە سۆزوعاتیفەمان تێکەڵی نووسینمان دەبێ، لەوانەیە سەد دەرسەد منیش لێی ڕزگار نەبووبم، بەلام نەک بەشێوەیەکی وا کە ببێتە هۆی

هەڵکردن، ئەوە دوور نییە زیان بە ئەمانەتی زانستی بگەیەنێ. جار هەیە عاتیفەی برادەرایەتی وا دەکات دانەرێ زیاتر لە قەبارەی خۆی ستایشی برادەرێکی خۆی بکات..

* ئەی لە کاری نووسین و لێتوێژینەوەدا ڕەنگدانەوەی دۆستایەتی و ناحەزی چەند کار لە باسکار دەکات؟

- لەکاری زانستیدا دوژمنایەتی و دۆستایەتی نییە، ئەگەر لێتۆژەر کەڵکی لە زانیاری کەسێک وەرگرت، هەرچەند بەینی لەگەڵیشیدا ناخۆش بێ هەر دەبێ وەک سەرچاوە ئاماژە بە کتێبەکەی بدات، ئەگەرنا ئەوە کارەکەی زانستی نابێ. لە نووسیندا نابێ مەرامی شەخسی بەکاربهێنرێ.

* پێت باشە کۆمەڵەیەک بۆ مێژوونووسانی کورد هەبێ؟

- پاش ڕاپەڕین پێکەوە کۆمەڵەی مێژوونووسانمان دروست کرد، بەڵام بەداخەوە کەس یارمەتی ئەم کۆمەڵەیەی نەدا، لەبەر ئەوە سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا.

* پێت وایە مێژووی شۆڕشەکانی کورد بە پوختی و زانستییانە نووسرابێتنەوە؟

- مێژووی شۆڕشەکانی کورد لە لایەن مێژوونووسانی کوردەوە لە کاتی خۆیاندا نەنووسراونەتەوە، بەڵکو بە گشتی کەسانی بێگانە لەسەر ئەم شۆڕشانەیان نووسیوە، بەڵام دکتۆر نورەددین دەرسیمی لە کاتی شۆڕشی دەرسیم-دا ئەو مێژووی شۆڕشی نووسیوە، یان پاش ئەو بەهەشتی مامۆستا عەلائەدین سەجادی کتێبێکی لەم بارەیەوە هەیە، (د. جەلیلی جەلیل) لێکۆڵینەوەی لەسەر شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلای شەمزینی ساڵی (١٨٨٠ - ١٨٨١) هەیە و ئاماژەی بە دیکۆمێنتی ڕووسەکان داوە، لەبارەی شۆڕشی بەدرخان و ئەحمەد پاشای بابان زۆر نەنووسراوە، محەمەد پاشای ڕواندزی د. جەمال نەبەزی زانا و بیرمەند نامەی دکتۆراکەی لەبارەوە نووسیوە، زۆر لە مێژووی ئەو شۆڕشانە بزرن، تەنانەت مێژووی کۆماری مەهابادیش ئەو کەسانەی تێیدا بەشداربوون و دوایی دەربەدەریش بوون، سەیرە کەسیان شتێکی وایان لەبارەیەوە نەنووسیوە، فارسەکان و (ئیگلتن) دەربارەی کۆماری مەهاباد کتێبیان داناوە، تەنانەت شۆڕشی (٣٠) ساڵەی خۆمان وەک پێشتر لێی دوام دەیان نووسەر و ڕۆشنبیر لەناو شۆڕش بوون نەمدی کەسیان

کـتـێـبـێـکی (١٠٠) لاپەڕەیی لەبارەوە بنووسن، ئێـسـتـا خـەڵک پەیدابوون یاداشـتی خۆیان دەنووسنەوە، کەچی هێـشـتـا (٩٠٪)ی مـێژووی ئەو خەباتە نەنووسراوەتەوە، دۆکیومێنتەکانی شۆڕش بزر بوون و لەنێوچوون شتێکی کەمی نەبێت کـە مـاون. ئەمـە نیـشـانەی ئەوەیە بیـری نووسینی مێژوو لەناو کورددا دواکـەوتوو بووە، مـێـژوونووسـانی وەک (مـحـەمـەد ئەمین زەکی) و (تۆفـیق وەهبی) و کـەسـانـی دیکە زۆر هەوڵـیـان دەدا هۆکـاری ئەوە بزانن بۆچی بیـری مـێــــژوونووسین لەنـاو کــورددا نەبووە، یان یەکــجـــار لاواز بووە، بەڵام نەگـەیشـتـوونەتە ئاکـامی بنەبڕ و تەواو، منیش بیـرم لەوە کـردووەتەوە و نەگەیشتوومەتە ئەنجامی کۆتایی.

(ئیبن خـەلدوون) دەبێـژێ: **«لە هەر شـوێنێ دەوڵەت هەبێ مـێژوو نووسین هەیە»**، یانی دەوڵەت و مێژوونووسینی پێکەوە گرێداوە، شەڕو شۆڕ و باج و خەراجی دەوڵەت، نووسینی مێژوو دەسەپێنێ، بە نیـسـبـەت کوردەوە ڕاسـتە کوردستان لەپاش دەوڵەتی (ماد-میدیا) بێ دەوڵەت بووە، لەپاش ئیسلام (لە سـەدەی دەیەم و یازدەیەمی زاییندا) هەندێ دەوڵەت دروست بوونە، بەڵام سەرانسەری کوردستانیان نەتەنیوەتەوە، وەک دەوڵەتی دۆستەکی کە (١٠٦) ساڵ لە کوردستانی باکوور لە هەرێمی دیاربەکر تا ناوچەی زاخۆ دەوامی کرد، یان تا نێـروە و هەندێ لە هەکـاری لەژێر دەسـەڵاتـیـدا بووە، یان (دەوڵەتی شەدادی) لە ئەرمـینیا و ئەزەربایجانی ڕووسیا و هەندێکیش لە کـوردستـانی باکـوور و ڕۆژئاوای ڕووباری ئاراس، هەروەها دەوڵەتی (حـەسـەن وەیهی) لە کـوردسـتـانی ڕۆژهەڵات لە ناوچەی کـرمـاشـان و سنە، تا نزیک هەمـەدان و تا بەشێکی زۆر لە لوڕسـتـان و تا سنووری خوزستـان و شارەزوور و زێی بچووک ڕۆیشتـووە، بەڵام دەوڵەتێکی سەرانسەر نەبووە کە خاوەن دەسەڵاتی سـەربازیی زۆر بێت و بتـوانێ هەندێ لە وڵاتانی دەوروپشت بخاتە ژێر دەستی خۆی وەک دەوڵەتێکی مەزن، پاش دەوڵەتی دۆستەکی، ئیبن ئەلزرەقی فـارقی ئەحمەدی کوڕی یووسـفی فـارقـینی، کـتـێـبـێکی مێژوویی لەبارەی دیاربەکر و فـارقـینی (تاریخ مـیـافـارقین و آمد) نـووسیـوە، نیـوەی تایبـەتە بە دەولەی دۆسـتـەکی، بـەنـاوی (الدولـة المروانیـة) ئەمـە مـێژوونووسـێکی کـەم وێنە بوو، ئەو بەشـەی پێوەندی بە (دەولەی دۆستەکی)یەوە هەیە بووە بە بنەچەی کـتـێبـەکەم «الـدولـة الدوستکیـة فی کوردستـان الوسطی» بە هەردوو بەرگـەوە، نەبوونی دەوڵەتێکی

گەورەی کورد بۆ ماوەیەکی زۆر هۆیەکە بۆ دروست نەبوونی ئەو مێژووەی کە ئیبن خەلدوون دەیڵێت، بەڵام کورد وەک ئەرمەنیشی پێ نەکراوە کە ئەوانیش خاوەن دەوڵەت، یان دەوڵەتێکی سەرانسەری ئەرمینیا نەبوون، بەڵکو وەک هەندێ ئیمارات لە کاتی ئیسلامدا هەبوون، ئەرمەنی لە کورد خراپتریان بەسەر هاتووە، بەشێکیان وڵاتیان بەجێ هێشتووە و چوونەتە نیزیکی دەریای ناوەڕاست، کەچی مێژووی خۆیان نووسیوەتەوە، لەگەڵ ئەوەی وەزعیان لە هی کورد باشتر نەبووە و وڵاتیشیان گەورەتر نەبووە، بۆچی ئەوان نووسیویانە؟ ئەمە وەک لە تیۆری ئیبن خەلدوون-دا هاتووە مێژوونوسین لە لای کورد بەهۆی بێ دەوڵەتی نەبووە، ئەی بۆ ئەرمەن مێژوونووسی مەزنی تێدا هەڵکەوتووە؟ ئایا ئەمە لەناو کورددا سیفەتێکی بۆماوەیی بووە کە حەزی بە نووسینەوەی مێژووی خۆی نەکردووە؟

بۆ نموونە (دەوڵەتی ماد) کە بە دەوڵەتێکی کوردیی حیسابە، ئەمە ئیمپراتۆریەتی گەورەی هەبووە، بۆچی نووسینی کەمە، (دیاکۆنۆف) دەبێژێ تا ئێستا یەک نووسینی بەڵگەنامەیی ماد لە بەردەستدا نییە، بۆچی دەوڵەتەکانی پێش و پاش ئەو نووسینیان زۆرە؟ هەندێ کەس دەڵێن دوژمنانی ماد هەموو نووسینەکانیان فەوتاندووە، ئەمە ڕاست نییە، بۆچی وەختێ (کۆرش) ئینقلابی لەسەر زوحاکی باوکی دایکی خۆی کرد یەکسەر لە شاخی ئەڵوەن لە دۆڵی (عەباس ئاباد) لەسەر بەردی ئەو دۆڵە پەیکەری سەرکەوتنی خۆی نووسی و لەوێی بەجێ هێشت؟ ئەخمینییەکان نووسینیان یەکجار زۆرە، بۆچی ماد نییەتی؟ بۆچی ئاشووری و بابلی و سۆمەر و ئەکەدییەکان زۆر نووسینیان، بەسەدان هەزار لەوحی مسمارییان بەجێ هێلاوە و ماد بەجێی نەهێشتووە؟، بۆچی گوتییەکان کە لە هەزارەی سێیەمی پێش زایین هەموو عیراقی داگیر کرد نووسینیان زۆر کەمە، بەڵام ئەوانەی پێش و پاش ئەوانن نووسینیان یەکجار زۆرە؟ دەوڵەتی (لۆلۆ) ماوەیەکی زۆر کوردی لەژێر دەست بووە، لە خۆرئاوای کرماشان-ەوە تا دەریاچەی ورمێ، هەندێ جاریش هەموو ناوچەی هەولێریشیان لەژێر دەست بووە، ئەگەرچی هەندێ نووسینیان لە سەرپولی زەهاو، یان لە دەربەندی (بێلووله) هەیە، بەڵام ئێستا ئەوە زۆر بە کەم دادەنێن، دیسان لەبارەی دەوڵەتی گوتییەوە هەندێک دەبێژن دیارە دوای ئەوان سۆمەرییەکان کە هاتنە سەر حوکم نووسینی ئەوان و پەیکەرەکانیان

لەناو بردووە، بەڵام ئەمە بەڕاست نازانم، واتە لەنێو گەلانی کۆنی کوردستان هوشیاری مێژوونووسین لاواز بووە، هەر لە گوتی و لۆلۆ و کاردۆخی تا مادەکان، بەڵام لە زەمانی حوورییەکان کە لە کوردستانی باشوور حوکمیان کردووە و لە بەشی ڕۆژئاوا و لە باکووری سوریاش بەشی (میتانی) حوکمیان کردووە نووسینیان کەم نەبووە، نزیکەی شەش هەزار لەوحی مسماری تەنیا لە (نۆزێ) لە نزیک شاری کەرکووک دۆزراونەتەوە، ئایا ئەمە سیفەتێکی ویراسی بووە لە کورددا کە حەزی بە مێژوونووسین نەکردووە، یان ئەم میللەتە دووربین نەبووە، چونکە دووربینی و مێژوو زۆر بەیەکەوە بەندن، یان دووربینی و بیری سیاسییان نەبووە، ئەمەش وەک خاڵێ مرۆڤ بیری لێ دەکاتەوە. نەبوونی دووربینی وەک سیفەتی ویراسی و نەبوونی دەوڵەتی گەورەش هۆکارن بۆ ئەوەی کورد لە ڕووی نووسینی مێژووەوە لاواز بێ، یان کورد متمانەی بەخۆی نەبووە، لە ئاکامی ژێردەستی دوور و درێژ شتی خۆی بە گرنگ نەزانیوە و بووە بە میللەتی پاشکۆی میللەتانی بێگانە، ئایا ئەمەش هۆکارێکە بۆ ئەوەی بڵێین کورد لە پێش ئیسلامەوە مێژووی خۆی نەنووسیوە، بە مەرجێ عەرەب و فارس و تورک مێژووی خۆیان بە نووسین پتەو کردووە کە بوونەتە سێ سەرچاوەی سەرەکی بۆ مێژووی میللەتی کورد.

خۆرهەڵاتناسان کە لە ئەورووپاوە هاتوون و لەم چەند سەد ساڵەی دواییدا هەندێکیان لەسەر کورد نووسیوە، ئەمە هەندێکە لە هۆکارەکان و هەمووی ڕۆڵی خۆیان لە نەنووسینی مێژووی کورددا هەبووە، تا میری خاوەن هیممەت کە (شەرەفخانی بتلیسی)یە هات، ئینجا مێژووی تەواوی لە سەدەی شازدەیەمدا بۆ کورد دانا کە تایبەتە بە مێژووی دەوڵەت و ئیماراتی کوردییەوە، ئەمەش یەکەم کتێبێکە کە لەسەر بنەڕەتی نەتەوەیی دەوڵەت و شۆڕشەکانی ئەوسا، کوردی بەسەر کردۆتەوە، وەک بیستوومە دیارە ئەم قسەیە بە دەم هاتووە، تەنانەت شەرەفخان بیری لە دەوڵەتێکی کوردی کردۆتەوە، لە ژێرەوە لە ترسی دەوڵەتی عوسمانی هەوڵی داوە و لە ناوچەکانی وان و بدلیس و ئەوانە پێوەندی بە میرانی ئیمارەتە کوردییەکانەوە کردووە، پاش شەرەفخان مێژووی کورد دابڕا و هیچ مێژوونووسێکی تر لە سەدەی حەڤدە و هەژدەیەم نابینرێ کە کتێبی وەک شەرەفنامەی دانابێ، جگە لە هەندێ هەوڵی بچووک بچووک نەبێ، تا سەدەی نۆزدە و بیستەم هەندێ بیری نووسینی مێژووی کورد

هاته پێش، (ئەمین زەکی بەگ) پاش شەرەفخان دووەمین کەسی کوردە کە بە فراوانی مێژووی کوردی نووسیوەتەوە، مێژووی کۆن و سەدە ناوەنجییەکان و نوێ و ئیماراتی کوردی و ناودارانی کوردی نووسیوە، لەبەر ئەوە ئەویش مێژوونووسێکی مەزنی کوردە، شۆڕشەکانی کوردیش کە پرسیارتان لەبارەوە کرد، ئایا مێژوویان نووسراوەتەوە، بەلامەوە شتێکی وا نەنووسراوە کە لە ئاستی ئەو شۆڕشانەدا بێ، بەتایبەتی سیاسییەکانی کۆماری مەهاباد وەک (هێمن و هەژار و عەبدولڕەحمان زەبیحی) کە ڕایانکرد بۆ دەرەوە دەبوایە مێژووی کۆماری کوردستانیان نووسیبا، بەڵام ئەوانیش هیچیان نەکرد، کۆمەڵێ مێژوونووس کە خەڵکی کوردستان بوون، مەرج نییە هەموویان لە کوردستان لە دایک بووبن، بەڵام کورد بوون، ئەوانیش مێژووی کوردستانیان بەشێوەی تایبەتی نەنووسیوە، وەک: ئیبن ئەثیر و ئیبن خەلەکان و زەهەبی و عەینی و ئیبن خەمیسی دیاربەکری و ئەبولفدای ئەیووبی، ئەمانە مێژووی گشتییان نووسیوە، هەندێ شوێنەواری گەورە لە لایەن ماد، یان لە لایەن میللەتانی پێشترەوە هەبوو، کەچی لەسەر ئەو شوێنەوارە گرنگانە نووسینێ نییە، بۆ نموونە ئەشکەوتی فەقرەقا لە نزیک مەهاباد کە مەزاری پاشای ماد (فرائورتسە)ی لێیە، کەچی نووسینێکی لەسەر نییە.

(ئەشکەوتی کوڕ و کچ) و ئەشکەوتی (قزقاپان) کە هی سەردەمی مادن نووسینیان لەسەر نییە، ئەگەر ئەم شوێنەوارانە لە لای میللەتێکی سامییەوە دروست کرابان بێ نووسین نەدەمانەوە، بە ڕاستی (سامی)یە کۆنەکان زۆر حەزیان لە نووسین بووە، تەنانەت هەندێ ئیمارەتی بچکۆلەیان نووسینیان لێ بەجێ ماوە، حەزیان لە نووسین و مێژوو بووە، ئارامییەکان پیتە (ئەبجد)ییەکانی خۆیان لە جیهانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئەوکاتە لە یۆنانەوە بگرە تا هندستان سەپاند. میدییەکان هاتن و ئاشوورییەکانیان لەنێو برد و حوکمی کوردستانیان کرد، بەڵام بۆچی شوێنەوار و نووسینی لەسەر بەردی شاخەکانی کوردستان بەجێ نەهێشت؟ بەلایەنی کەم دەبووایە لاسایی ئاشوورییەکانی بکردایەتەوە، کە ئەمەش نەبووە. سیفەتی ویراسی لە لای من دەوری خۆی لە مەسەلەی بایەخ نەدانی کورد بە نووسینی مێژوو هەبووە، ئەم چەند هۆکارە دەوریان هەبووە و ئەگەر وردتر شی بکەینەوە ڕەنگە هەندێ هۆکاری تریش بە دیار بکەون.

کادیره سیاسییەکانی خۆمان زۆر کەم یادەوەریی خۆیان بەجێ هێشتووە، زۆریان پێ وترا بۆچی یاداشتی خۆتان نانووسن، هەر نەیاننووسی. بۆچی تورک کە میللەتێکی کۆچەری بوو هاتە ناوچەی ئەنادۆڵ و خۆی کردە وارسی شارستانییەتە کۆنەکان و شوێنەوارەکانیان لە (حیثی)یەکانەوە بگرە تا بێزەنتییەکان بۆخۆیان تۆمار کرد؟ بۆچی فارس بایەخیان بە مێژووی خۆیان داوە، بەتایبەت زۆر لە مێژوونووسان لەسەر دەوڵەتی سەفەوی و شەڕوشۆڕیانی نووسیوە و بەهۆی ئەوەوە میقدارێکی چاکی مێژووی کوردستانیشیان نووسیوەتەوە، ئەمە خاڵی لاوازی کوردە و قەت ناتوانرێ ئینکاری بکەین.

* ڕۆژهەڵاتناس و مێژوونووسانی ئەوروپا و عەرەب و تورک و ئەرمەن و فارس چۆن لە مێژووی کورد دواون؟

– بێگومان عەرەب کە خاوەنی دەوڵەتی ئیسلام بوون لە کاتی خولەفای ڕاشدین و ئومەوی و عەبباسی، لە بارەی فتوحاتی ئیسلامییەوە مێژوویان نووسراوەتەوە، لە لایەن واقدی، بلادزی و هی دیکەوە کە لە نووسینەکانیاندا باسی بەرگری کردنی کورد و داگیرکردنی وڵاتەکەشی هاتووە، ئیتر کە دەوڵەتی ئەمەوی و عەبباسی دروست بوون کوردستان هەرێمێکی ژێر دەستی ئەوان بووە، مێژوونووسانی عەرەب زۆر ڕووداوی کوردیان نووسیوە، لەبەر ئەوەی فارس یانی دەوڵەتی سەفەوی، کە بەشێکی زۆری کوردستان کەوتە ژێر دەستی عوسمانی، ئەو ڕووداوانەی لەنێوان میرانی کورد و دەوڵەتی سەفەوی و عوسمانی ڕوویانداوە، یان پێوەندی میرانی کورد بە هەردوو دەوڵەتەوە، یان شەڕوشۆڕی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێران کە زۆری خایاند، بێگومان لەو نێوانەدا کوردستان مەیدانی شەڕی نێوان هەردوولا بووە، سوپای عوسمانی لە (سنە)وە کە تێپەڕیبێ بۆ ناوچەیەکی وەک هەمەدان، یان سوپای ئێران لە مووسڵ تێپەڕ بووبێ، ئەو شەڕانەیان دەبوونە هۆی وێرانبوونی کوردستان، هەندێ لەو ڕووداوانە لە بەرژەوەندی مێژووی کورد دەنووسران، ئەرمەنیش هەندێ لە مێژووی کوردیان لە سەرچاوەکانی خۆیاندا نووسیوە، چونکە دراوسێی کوردەکان بوون و پێوەندی و شەڕوشۆڕی نێوان ئەرمەن و کورد لە کۆنەوە هەر هەبووە، وەک دوو میللەتی دراوسێ، هەر تەنیا ئاشتی لەنێوانیان نەبووە، ئەرمەنییەکان بەبێ ئینسافی دژی کوردیان نووسیوە. ڕۆژهەڵاتناسەکان لە ڕەچەڵەکی ڕووس و ئەوروپاییەکان لەم (٢٠٠-٣٠٠) ساڵەی دوایی

بایەخیان بە مێژووی کورد و مەسەلەی کورد داوە، زۆریان هاتوون لە کوردستان گەڕاون و لە بارەی فۆلکلۆر و جوگرافیا و مێژووی کوردیان نووسیوە وەک ئەلەکساندەر ژابای قونسلی ڕووس لە ئەرزەڕووم کە دەوری باشی هەبووە و دەستنووسی کوردی کۆکردۆتەوە، مینۆرسکی دەوری زۆری هەبووە، دیاکۆنۆف کتێبی لەسەر مێژووی ماد داناوە، نووسینی ڕووسەکان لەسەر کورد لەپێش بەرپابوونی شۆڕشی ئۆکتۆبەر زۆر زانستی و واقیعیتر بووە، بەڵام پاش شۆڕش ئەو نووسینانەی بە عاتیفەی مارکسیستی لەسەر کورد دەنووسران لاواز بوون، دەتوانم بڵێم ئەو لاوازییە لە نووسینی مێژوونووسانی چەپی کوردیشدا دیارە، کە بەشێکی مێژووی کوردیان بە شۆڕشی ئۆکتۆبەرەوە گرێداوە لە کاتێکدا پێوەندی بە مەوزوعەوە نەبووە و پڕوپاگەندەیان بۆ شۆڕشێک کردووە کە شتێکی وای بە کوردەکانی خۆی نەدا، ئەم خاڵە لاوازە نا زانستییتی ئەو مێژوونووسانە دەردەخات کە چەپ بوون.

یەکێتی سۆڤیەت کۆماری مەهابادی تەسلیمی ئێران کرد و پشتگیری لە شۆڕشی «٣٠» ساڵەی ئێمە نەکرد، شۆڕشی کورد لە کوردستانی باکوور کە چەپ بوون سۆڤیەت و ڕووسیا پشتی تێکرد، لەگەڵ ئەوەشەوە مێژوونووسانی خۆمان هەر دەف و زوڕنایان بۆ یەکێتی سۆڤیەت لێ دەدا، هەروەک نۆکەری ئەوێ بن، کۆچ پێکردنی کورد لەلایەن یەکێتی سۆڤیەتەوە دەستی پێکرد، لەوانە کوردەکانی کوردستانی سوور و ئەرمینیا کە بۆ سیبیریا کۆچیان پێکرا، ئەمە یەکێکە لە تاوانەکانی شۆڕشی ئۆکتۆبەر، کەچی لەلای مێژوونووسانی کوردەوە ستایشی یەکێتی سۆڤیەت دەکرێ، یەکێکی وەک (د. کەمال مەزهەر) لە گۆڤاری بەیانی ژمارە (٦-٧) نووسیویەتی: (شۆڕشی ئۆکتۆبەر هێندەی داوە بەکورد کە بە خەیاڵی کەسدا نەیەت) ئایا ئەمە ڕاستە؟ ئەی دوایی کە یەکێتی سۆڤیەت ڕووخا بۆچی سێ ئەڵقەی لەسەر تاوانەکانی سۆڤیەت لە ڕۆژنامەی (هاوکاری)دا بڵاوکردەوە کە چۆن کوردی تەهجیر و ماڵوێران کردووە؟ ئەی بۆچی ئەوێک کە (٣٠) ساڵ بوو زانیاریی وای هەبوو بە شەو و بە ڕۆژ ستایشی یەکێتی سۆڤیەتی دەکرد و ئەم حەقیقەتانەی دەشاردەوە؟ ئەمە هەڵوێستێکی دووفاقیانەیە، چونکە تا یەکێتی سۆڤیەت مابوو لە نووسراوەکانی خۆیدا پڕوپاگەندەی بۆ دەکرد، کەچی کاتێ لەناوچوو لە دژی نووسی، ئەمە هەڵوێستێکی دژ بەیەکە، ئەو لاوازییە لە نووسینەکانی

مێژوونووسانی مارکسی زۆر بە زەقی دیارە، بەڵام ئەوانەی کە ئەوروپایی بوونە و لەسەر کورد نووسیویانە لە ڕووسەکانی پاش سەرهەڵدانی شۆڕشی ئۆکتۆبەر واقعیانەتر و وردتر بوون، بێگومان فارس و تورکەکانیش زۆر مێژوونووسیان هەبووە لە بەرژەوەندی کوردیان نەنووسیوە، سوپای عوسمانی کە دەچوو ئەمارەتێکی کوردی وێران دەکرد، مێژوونووسی پاشای بەغدا دەهات دژی میرە کوردەکانی دەنووسی، یان شاعیرانی وەک (سوێدی) و شاعیرانی پاشاکانی بەغدا کە دەهاتن بۆ (شەڕی قەمچووغە) و شەڕی (ئاوەگرد)، ستایشی پاشای بەغدایان دەکرد و زەمی کوردیان دەکرد، وەک شۆڕشەکانی ئێستا کە کورد داوای مافی خۆی دەکات، کەچی ئەو دەوڵەتانە جۆرەها تۆمەتیان بۆ دروست دەکرد وەک میللەتی شەڕخواز و ڕێگر کە حەز لە زوڵم و زۆرداری دەکات، لە کاتێکدا کورد میللەتێکی بێ دەسەڵاتە، لەبەر ئەوە زۆر لەو مێژووە نووسراوە ڕاست نییە، بە تایبەت ئەمانەی سەدەی بیستەم، ئیتر مێژوونووسانی تورک و فارس زۆر دژی کوردییان نووسیوە و ئامانجەکانی شۆڕشەکانی کوردییان شێواندووە.

ئەولیا چەلەبی-ی تورک کە بەرگی چوارەمی سیاحەتنامەکەی سەرومڕ لەسەر کوردە، وەک بێلایەنێک زۆر بە جوانی باسی مێژووی کوردی کردووە، بە ڕاستی کورد قەرزاری ئەولیا چەلەبییە، چونکە مێژوونووسێکی بەویژدانە و شایانی ڕێزلێگرتنە. (محەمەد کەسرەوی) مێژوونووسی فارس دەوری باشی لە نووسینی مێژووی کورددا هەبووە، بەتایبەت مێژووی سەدە ناوەنجییەکان و زۆر بە باشی لەسەر کوردی نووسیوە کە مێژوونووسێکی زانستخواز بووە و تا لە پێناوی گەیاندن و نووسینی ڕاستییە مێژووییەکان کوژرا، هەروەها شەمسەدین سامی خاوەنی (قاموس الأعلام)ی تورکی کە چوار بەرگی گەورەیە، زۆر جوان باسی کوردی کردووە و دوور لە دەمارگیری نەتەوەیی باسی ناودارانی کوردی کردووە و ستایشی کوردی تێدایە و بە ویژدان بووە.

دوو جۆرە مێژوونووس لەلای فارس و تورک و عەرەب بەرانبەر بە کورد هەبووە، مێژوونووسانی پێش قۆناغی نەتەوەیی توندوتیژی فارس و عەرەب و تورک ئەوانە نووسینیان سەنگینتر و چاکترە، دوای ئەوان و پاش پەیدابوونی حزبی نەتەوەیی عەرەبچی و تۆرانچی و فارسچی ئەوانە خراپیان لەسەر کورد نووسیوە و کەوتوونەتە ژێر کاریگەری حکومەتەکانی خۆیان و هەندێکیان لە

دەزگاکانی ئەمن و موخابەراتدا کاریان کردووە.
کەسانی وەک تەها هاشمی و مەحموود دورە لەژێر کاریگەری نەتەوەیی توندوتیژی عەرەبیدا خراپیان لەسەر کورد نووسیوە، بەڵام کەسێکی وەک عەبدولڕەزاق حەسەنی ئەو دەمارگرژییە لە نووسینەکانیدا نابیندرێت و ئەمین بووە، ئەمیش وەک عەباس عەزاوی مێژوونووسی گەورەی عێراق بووە، عەزاوی کتێبەکانی لە ناوبانگی خۆی گەورەترە و دەربارەی ئیمارەتی بادینان و کاکەیی و عەشایەری کورد بەجوانی نووسیوە، دەربارەی شارەزووریش شتی هەیە و چاکی نووسیوە، بەڵام لە کتێبەکەیدا (عشائر العراق- الكردية)دا تووشی هەڵەی نازانستییانە بووە، هەندێ نەتەوەیی عەرەب هەبوون باشیان نووسیوە لەوانە: ئەحمەد فەوزی خاوەنی «قاسم والأكراد خناجر و جبال» ئەوانەی تەوژمی ناسری بوون باش بوون، هەندێکیان دۆستی کورد بوون وەک مامۆستا (هيلال ناجي) چامەی لەسەر کورد هەیە و بەو ڕادەیە دڵسۆزە دەڵێ پێم خۆشە دەوڵەتی کورد ببینم، ئەمانە تەوژمی ناسری بوون بەعسی نەبوون، نەتەوەیی عەرەبی بوون و ویستوویانە هەڵوێستی نەتەوەیی عەرەب بەرانبەر کورد و بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردستان باش بێ.
کتێبەکانی دکتۆر ناجي مەعرووف هەمووی سست و خاون و دیدی بەرانبەر کورد ڕەش بووە، کتێبەکەی «عروبة العلماء المنسوبين الى البلدان الأعجمية» چەند بەرگێکە شتێکی زانستی نییە و پڕە لە چەواشەکاری، ئامێدی کردۆتە شارێکی عەرەبی، نەیزانیوە ناوی ئەو شارە خۆی تەعریب کراوە و ناوی ئەسڵی خۆی نییە، کە شارێک بووە لەپێش (حیرە)ش هەبووە، شوێنەواری دەوڵەتی ئەشکانی لێیە، دوورنییە ئامێدی لە وشەی (ماد)ەوە هاتبێ، هەر ناوێکی کوردی لە عەرەبی نزیک بووبێ ئەم ناجی مەعرووفە تەعریبی کردووە و کوردستانی بە (مێژوو) تەعریب کردووە.
هەندێ مێژوونووسی عەرەب بە ویژدان بوون لەوانە شاکر خەسباک کە چەند کتێبێکی جوان و گرنگی لە بارەی کوردەوە هەیە. هەندێکیشیان لەژێر کاریگەریی بیری نەتەوەیی عەرەبی لە زانست لایان داوە و خراپیان لەسەر کورد نووسیوە، لەبەر ئەوە ناتوانین بڵێین مێژوونووسانی تورک و فارس و عەرەب هەموویان خراپیان لەسەر کورد نووسیوە، هەندێکیان باشن و هەندێ خراپ نووسیویانە.

* ئەی کوردۆلۆژی هاوچەرخ بەرەو کوێ؟

– لە هەر بوارێکدا کە پێوەندی بە کوردەوە هەبێ چ لە بواری مێژوو، یان ئەدەب، یان کەلەپووری نەتەوایەتی و شارستانێتی کورد، بەردەوام بەرەو پێش دەچێ بە قەد بەرەوپێشچوونی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردستان، مێژووی کوردیش هەر بەو شێوەیە هەر بەرەو پێش دەچێ، چونکە مەسەلەی کورد بەرەو پێش دەچێت.

* پێت وایە سەرلەنوێ و لەبەر باری سەرنجێکی ئەکادیمییانە مێژووی کورد بخوێندرێ و بنووسرێتەوە؟

– پێویستە مێژووی کورد بە پێی بەرنامەی لێکۆڵینەوەی زانستییانە و بەشێوەی ئەکادیمی ڕێک و پێک بنووسرێ، کۆمەڵێ تێزی ماجستێر و دکتۆرا لە بارەی کوردەوە نووسراون، ئەمانە باش و زانستین، ئەوانەی لە زانکۆکان دەرچوون ئومێدێکی چاکیان لێ دەکرێ کە خزمەتی باشی مێژووی کورد بکەن و لەسەر بناغەی زانستی بنووسن، لەوانە تێزی ماجستێری دکتۆر حوسامەدین نەقشبەندی دەربارەی دەوڵەتی (حەسەن وەیهی)، یان ئەوەی دکتۆر نەبەز مەجید دەربارەی دەوڵەتی ئەیووبی، یان ئیسماعیل شوکر کە ماجستێرەکەی دەربارەی «الشدادیون فی بلاد الران- ٣٤٠-٥٩٥ هجری» شتێکی جوانە و دیومە لەگەڵ ئەوانی تردا دەتوانم بیروڕا لەبارەیانەوە بدەم، ئەمانە خزمەتی مێژووی کورد دەکەن و پێگەیشتوون و لە زانکۆی سەلاحەدین و سلێمانی مامۆستای مێژوون و هیوای کاری باشیان لێ دەکرێت، کە تێزەکانیان لەسەر ڕێبازی نوێی ئەکادیمی نووسراون.

* پێت وایە پێویست بێ مێژووی کورد لەلایەن مێژوونووسانی خۆمانەوە وەربگێڕدرێنە سەر زمانانی دنیا؟

– ئەگەر ئەو کتێبانەی تایبەتن بە مێژووی کورد بۆ ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەڵمانی و زمانەکانی دیکە تەرجەمە بکرێن ئەمە خزمەتێکی گەورەیە، تا ئەو میللەتانە شارەزایی لە مێژووی کورد پەیدا بکەن و فیکرەی باشی لێ وەربگرن.

لەو مێژوونووسانەی کە بێلایەن بوون مامۆستام (سەعید دیوەچی) لەو مێژوونووسانەیە کە لایان نەداوە و زانستییانە شتیان نووسیوە، ناجی مەعرووفیش نووسەرێکی چەواشەکارە. ئێمە قەرزاری کەسانی وەک

مینۆرسکین، هەن لەسەر هەندێ لە ڕووداوەکانی کوردستانیان نووسیوە، ئەگەرچی ڕووداوی ناهەموارن، بەڵام ئەگەر نەنووسرانایە دەفەوتان، بۆیە هەر بە باشیان دەزانین.

* پێشتر باسی بەرنامەی لێکۆڵینەوەی مێژووییت کرد، ئەو بەرنامەیە چۆنە و کێ دایناوە؟

– لە سەدەی سێزدەدا یەکەمین کەس «ئیبن خەلدوون» بەرنامەی لێکۆڵینەوەی مێژوویی داناوە، لە کتێبەکەیدا «العبر» بەرگی یەکەمی بەناوی(مقدمة ابن خلدون) بەناوبانگە، لە لاپەڕەی نۆیەم وا پێناسەی مێژوو دەکات «هونەری مێژوو باس لە ئەحوالی پێشینانە، لە میللەتانە، لە پێغەمبەران و پاشایان و ڕەوشتیان، هەروا سیاسەتی دەوڵەتان» ئەمە پێناسەکەیەتی.

لە لاپەڕەی (٣٥)دا دیسان دەربارەی مێژوو دەڵێ: «حەقیقەتی مێژوو ئەوەیە کنە و پشکنین لە کۆمەڵگەی مرۆییدا دەکا، ئەو کۆمەڵگەیەی پەرەسەندنی بەسەردا دێت باس لە دروست بوونی دەوڵەت و لەناوچوونیان دەکات، هەروەها لە کاری ئابووری و زانست و سیاسەت و پیشەسازی و هەر شتێ کە دروست ببێ لەژیانی مرۆڤدا دەکۆڵێتەوە و دەڵێ مێژوو خەبەرە، (الخبر ما یحتمل الصدق و الکذب)، (ئینشاء)یش وەها پێناسەکراوە: «الانشاء ایجاد معنی بلفظ یقارنه في الوجود» واتە مانایەکە لەگەڵ قسەکردن بێتە وجود وەک ئەمر کردن و بڵێ: (بڕۆ)، ئەمە ئینشایە قابیلی درۆ نییە، واتە کەسێ کە دەڵێ: (مەچۆ) ئەمەش قابیلی درۆ نییە. هەندێ ڕووداوی (خەبەر)یش هەیە کە زانینی (متواتر)ە و درۆ قەبووڵ ناکات، وەک بڵێ (بەغداد هەیە)، ئینجا کە مێژوو خەبەرە مومکینە ڕاست بێ، یان ناڕاست بێ، لەبەر ئەوە نابێتە زانست، کۆمەڵێ زانست هەن وەک زانستی نەحو و صەرف و کیمیا و فیزیا کە قابیلی ئەوە نییە ڕاست نەبێ، ئەگەرچی ڕێژەییش بێ، (ئیبن خەلدوون) بەرنامەی بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوو داناوە، تا بەهۆیەوە لە خەبەرەکان بکۆڵینەوە، ڕاستی و درۆیان لە یەکتر جیا بکەینەوە، هۆی ئەو ڕووداوانە چۆن دەدۆزینەوە، ئەنجامیان چۆن بەدەست دێنین، لە (ل٩) دەڵێت: «ئەگەر نووسینی مێژوو هەر تەنیا گوێزانەوە بێ، ئەوە زۆر مێژوونووس تووشی هەڵە دەبن، بەڵکو ئەو ئەخبارانەی مێژوونووس نەقڵی دەکات دەبێ لەسەر

ئسوولی ئەوانە نمایش بکرێن و لێیان بکۆڵێتەوە، یان لەگەڵ زانیاری دیکەی مێژوویی بەراوردیان بکات و دەڵێ «والناقد البصیر نظره قسطاس بحثه» لێتوێژەری ڕەخنەگر وەک تەرازووە بۆ ئەو زانیارییانەی دەیەوێت بە مەبەستی گەیشتن بە ئەنجامەکان وەریان بگرێ.

کەم هەیە هێزی لێکۆڵینەوەی تێدا هەبێ، زۆر کەس لە دانانی کتێبێ دەگاتە ئەنجام، بەڵام هاوکات لێتوێژەر نییە. (ئیبن خەلدوون) دەڵێ: دەبێ ئەو شتەی مێژوونووس باسی لێوە دەکا، یانی (خبر)ێک دەبێ لەسەر ئسوولی یاسا و ڕێسای مرۆیی بخرێتەڕوو تا مێژوونووس دووچاری هەڵە نەبێ، مێژوونووس پێویستی بە زانستی سیاسەتە، زانینی پەرەسەندنی کۆمەڵگەیە، ناکۆکییەکانی نێوان میللەتان، کە هەریەک لەو میللەتانە ڕەوشتی چۆنە لەگەڵ جۆرەها لێکۆڵینەوەی بارودۆخی جوگرافی ناوچەکە و لەبەرچاوگرتنی کات و شوێن، هەروەها دابونەریت و مەزاهیبی ئایینی میللەتان، پێویستە زانیاریی فراوانی دەربارەی ئێستا هەبێ و بتوانێ لە نێوان ئێستا و ڕابردوو بەراورد بکات، خەبەرێک کە (متفق علیه) باس بکات و وەڵامی ئەوە بداتەوە کە بۆچی زانایان لەسەر ئەو خەبەرە وەستاون، یان بۆچی لەسەر مەسەلەیەک نەگونجاون، دەبێ زانیارییەکان (قیاس) بکات و شارەزای دروست بوونی دەوڵەت و هۆ و بنەڕەتەکانی دروست بوونیان بزانێ، ئەحوالی ئەوانەی دەوڵەتانیان بەڕێوە بردووە بزانێ، بتوانێ هەر ڕووداوێکی مێژوویی هۆکارەکانی بدۆزێتەوە، خستنەڕووی کۆمەڵێک لە یاسا و ڕێسا و ئسووڵ، ئەگەر یەکیان گرتەوە ڕاستە، ئەگەر نا هەڵە دەکات، مێژووی کۆمەڵایەتی دەبێتە ڕێگای گرنگ بۆ مێژوونووس تا سوودی لێ وەربگرێت کە باسی بارودۆخی سیاسی دەنووسێت، دەبێ بزانێ ئەو کۆمەڵگەیە لە ڕابردوویدا داوونەریتی لە هەموو بوارێکدا چۆن بووە، نەک زانیاری ئەو کاتە لەسەر ئێستا بپێوێ و بە چاوی ئێستا تەماشای بکات کە ئەوە مەقبوول نییە، چونکە ئەوکاتە مێژوونووس تووشی هەڵە دەبێ، ناسینی ڕابردوو بناغەیە، هەروەها لە بەرنامەکەیدا بۆ مێژوو دەڵێ زۆر مەسەلەی کۆمەڵایەتی دەبێتە زانستێکی هاوکار بۆ مێژوونووس، چونکە یاسای لێکۆڵینەوە بۆ زانینی ڕاست و ناڕاست لە (ئەخبار)دا دەبێ بە زانستی کۆمەڵایەتی مرۆیی بەراورد بکات و بزانێ ئایا ئەو شتە مومکینە ببێ یان نا، باسی هەڵە شاراوەکان (الاخطاء الخفیة)

دەکات کە مێژوونووس تووشی دەبێ، (تەعدیل) و (تەجرید) واتە چۆن مێژوونووسێ هەڵدەسەنگێنی کە زیرەکە و جێگەی بڕوایە، (تەجرید) واتە بتوانی ئەو مێژوونووسە وای پیشان بدات کە متمانەی پێ نەکرێ و هۆکاری ئەمە ڕوون بکاتەوە.

هەروەها باسی هۆیەکانی هەڵەی مێژوونووس دەکات، لەوانە دەمارگیری نەتەوەیی و ئایینی و متمانەکردن بەوانەی زانیاری و خەبەرەکەیان گواستووەتەوە، بۆ ئەمەش پێویستە بەرانبەر گەورەترین مێژوونووس گومانت هەبێ و لێکۆڵینەوە لە زانیارییەکانی بکرێ، ئینجا زانیارییەکانی وەربگیرێ، یان لە کاتێکدا نەزانی مەبەستی ئەو مێژوونووسە چییە و زۆر دیقەت لە مەبەستەکەی نەدات، ئەوەش هۆکارێکە لە هۆکارەکانی هەڵەکردن، یان نەزانێ چۆن زانیاری خۆی لەسەر باری کۆمەڵایەتی و پەرەسەندنی کۆمەڵگە جێبەجێ بکات، یان نزیک بوونی لە کەسانی بەرپرس و خاوەن دەسەڵات، ئەوەش هەوڵدانێکە دەبێتە هۆی هەڵەکردن و لایەنگیریی دەخولقێنێ. هەر ڕووداوێ خاسییەتی خۆی هەیە، ڕەخنە بە تەنیا ڕەت کردنەوە نییە.

هەروەها ئیبن خەلدوونی مەزن دەڵێ پیتەکانی ئەعجەمی واتە غەیری عەرەبی وەک (پ، ڤ، گ، چ، ژ) ئەمانە پێویستە بە ڕێنووسی ئەو میللەتانە بنووسرێن نەک بگۆڕێن بە حەرفی عەرەبی، ئەمە هەڵەیە دەبێ وەک ئەو وشەیە بنووسرێ کە لای میللەتەکە قسەی پێ دەکرێت. بە ڕاستی ئەمە گرفتێکی جیهانییە لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ خەڵکی لەسەر ڕۆیشتووە، کە ناوی شار و ناوی میللەتێکی تر بێنی نابێ بەپێی (لفظ)ی خۆت بیانگۆڕی، دەبوایە ڕێکخراوی نێودەوڵەتی (UN) و (یۆنسکۆ) ئەم ئەرکە بگرنە ئەستۆ و ئەم هەڵەیە ڕاست بکرێتەوە و سنووری بۆ دابنێن، ئەو ناوی شار و کەسایەتیانە چۆن تەلەفوز دەکرێن هەر بەو شێوەیە بوترێن و بنووسرێن، وشەیەک لە هەر میللەتێ وەری بگری، دەبێ بەو شێوەیە بنووسرێ کە لەناو میللەتەکەدا هەیە، بۆ نموونە ناوی زوحاک بە هەشت شێوە هاتووە، کێ دەزانێ (ئیختنگو) ئەوەیە، یان (ئیشتومیگو) هەریەک بەشێوەیەک ناوی هێناوە لەوانە (ضەحاک، بیوەراسپ، ئاستیاک، ئیستاجیس، ئەزیدەهاک) و هی تر، ئەمە گرفتێکی جیهانییە ئیبن خەلدوون وەک زانایەکی لێکۆڵینەوەی مێژوویی ویستوویەتی باسی بکات و چارەی بۆ بدۆزێتەوە، پاش ئەو لە خۆرئاوا کە بەرنامەی لێتوژینەوە سەری

هەڵداوە هیچ دوور نییە کەڵکیان لە موقەدیمەی ئیبن خەلدوون وەرگرتبێ، لەوانە لە سەدەی هەژدەدا (کانت) و (ڤیگو) هەر لەنێوان سەدەی (١٧-١٨) پاشان لە سەدەی نۆزدەیەم قۆستیل و دیکۆیانت و مۆنێ و ئارنست و لانجووا و زانایانی تر، وەک دامەزرێنەران دەناسرێن، ئەو کەسانەی کە لێکۆڵینەوەیان کردووە، بناغە و ڕێگاکانی چۆنیەتی لێکۆڵینەوەیان دروست کردووە، ئەم مەنهەجە لە ئەڵمانیا و فەرەنسا و بەریتانیا بەکارهاتووە و درەنگ گەیشتۆتە وڵاتانی ڕۆژهەڵات، تا ساڵی (١٩٥١) لە زانکۆی قاهیرە نەخوێندراوە و نەبووە، دوایی مرۆڤێکی گەورەی وەک (جورجی زێدان) کە دەوری ئەو لە نووسینی مێژووی شارستانی لەلایەن مێژوونووسانی میسرەوە بزرکراوە چ بە پاڵنەری ئایینی بێ، یان هەر پاڵنەرێ بێ، چونکە مەسیحی بوو حەقی خۆی نەدراوەتێ، ئەسەد ڕۆستەم لە سییەکاندا کتێبی «مصطلح التاريخ»ی دانا، پاشان کەسانی تریش کتێبیان لە بواری بەرنامەی زانستیانە دانا لەوانە کتێبی «التأريخ فكرة و منهجا» یان «الكتابة التأريخية و المعرفة التاريخية»ی عەزیز العظمة کە کتێبێکی جوانە، یان «أصول البحث العلمي و مناهجه»ی د. محەمەد مەندوور، یان «عەبدولعەزیز دوری» لە «نشأة علم التاريخ عند العرب» ، یان «حەسەن عوسمان» لە «منهج البحث التاريخي» هەروەها عەبدولڕەحمان بەدەوی کە کتێبی لە ئەڵمانییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی بەناوی «النقد التاريخي» کە هی کۆمەڵێ مێژوونووسی فەرەنسی و ئەڵمانییە هی لانجووا و کانت و ئەمانەیە. ئێمە دەتوانین سوود لەم کتێبانە و هی تریش وەربگرین کە لەناو کوردا ئەم فیکرەیە زۆر دواکەوتووە، تەنانەت لەناو مامۆستایانی زانکۆکانیشدا هەن کتێب و نووسینەکانیان زۆر دوورە لە بەرنامەی لێتۆژینەوەی زانستی، دیسان د. کەمال مەزهەر دەکەمە نموونە و ئەگەر یەکێ کتێبی «تێگەیشتنی ڕاستی» بخوێنێتەوە، یان (دورالشعب الكردي في ثورة العشرين) ببینێ و لەم بوارەدا شارەزا بێ دەزانێ کە بە شێوەی کەشکۆڵێکی سادە نووسیویەتی و دوورە لە بەرنامەی لێکۆڵینەوەی زانستی، من بەپێی مەنهەجی لێکۆڵینەوەی زانستی ڕەخنەم لێگرتووە، ئەوەش ڕەخنە بوو لە کتێبی (تێگەیشتنی ڕاستی) کە لە ڕۆژنامەی -عیراق- بە مێژووی (١٩٨٠/٨/٢) بڵاوم کردەوە.

لە شەستەکاندا کەڵکی زۆرم لە (مقدمة ابن خلدون) بینی، من قەرزاری

دکـتـۆر ناجی عـەباسی هەولێـریم، کە جـارێـک سـەرنجی ڕاکێـشـام بچـمـە سـەر سەرچاوەی مـەنهـەجی توێژینەوەی زانسـتی و لەو جۆرە کـتێـبانە بخوێنمەوە و کەڵـک وەربگرم.

ئیـتـر زانیـاری زۆرم کـۆکـردەوە و سـوودی زۆرم بۆ چۆنیـەتی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لێ وەرگرت، ئەوەش لە هەردوو بەرگی کتێبی (الدولة الدوستكية)دا دیارە، کتێبێکم لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا بە ناوی (منهج البحث لتاريخ المدن مطبقاً علىٰ المدن الكردية) دانا، ئەمە باس لەوە دەکات چۆن لە بارەی شارەکانەوە بنووسین، ئەم کتێبەم دایە زانای ڕەحـمـەتی دکتۆر (عـەلی جەواد ئەلتـاهر) تا پێیدا بچێـتەوە و سەرنجی زانسـتیم بداتێ، ڕۆژێک دادێ نامـەی ئەویش بڵاو دەکـەمەوە. ئەم زانایە زۆر بەم کـتێـبەم مـوعـجەب بوو یەکـەمجار نووسیبووم «منهج البحث التـأريخي للمـدن الكـردية» ئەو ناوەکەی گـۆڕی بە «منهج البحث لتاريخ المدن مطبقاً على المدن الكردية» بە قەڵەمی ڕەساسیش لە هەندێ جێ ئاماژەی بە هەڵەکانم داوە، لێتـۆژەری بەهەشـتی گەورە گورگیس عـەوادیش ئەم کـتێـبەی منی خوێندووەتەوەو پێی مـوعـجەب بووە، بەرنامـەی لێـتـۆژینەوە چ ئەدەبی بێ، یان مـێژوویی ئێـسـتـا زانسـتـێکە و لە زانکـۆکـاندا دەخوێندرێ و کـتێبی زۆری لەبارەوە نـووسراوە، گرنگیدان بەم زانسـتـە لایەنی مێژوونووسی دەوڵەمەند دەکات و وا دەکات هەڵەی مێژوونووسان دەربخرێت و ڕەخنەی زانسـتی بگرێ و دەرەنجامەکـانی جوان بێ و تەنیـا لە سـەرچاوەکـانەوە ڕاگواستن نەبێ. دکتۆر (عەلی جەواد ئەلتاهر) کە لە عیراق زاناترین کـەس بووە لەم بارەوە کـۆمـەڵە مـەرجـێکی بۆ لێکۆڵەر (باحث) لە کـتـێـبـەکـەیدا (منهـج البحث الأدبي) داناوە و نووسیویەتی: پێویستە لەگەڵ دەقی مێژوویی لەکاتی گواستنەوەیدا ئەمین بێ، مرۆڤێکی ئایین پەروەر و چاک بێ پێویستە ستایشی درۆ نەکـات و مـەرایی بۆ ئەم و ئەو نەکـات، ئەگـەر بـاسی نیـازپاکی دوژمن بکات هاوکات باس لە چاکی و خراپی بکات، دەبێ زانا بێ لە چۆنیەتی نەقڵ کردن، پێویسـتـە لە دانانی ڕسـتـە و دەسـتـەواژەکـاندا ورد بێ، بزانێ مـەدلوولی هەر وشـەیەک چییـە و ئەو وشـەیە بەپێی مـانا دابنێ، زمـانی زانسـتی بزانێ چییە، وشە بەگوێرەی مانا بێ، دەسـتـەواژەی سۆزاوی و ئەدەبی دانەنێ، چونکە مێژوو زانستێکی مەیلەو وشکە.

تا ئەسـەد ڕۆستەم لە کـتێبی (مصطلح التاريخ)، لە لاپەڕە (٦٥)دا دەڵێت:

ئەو کتێبە مێژووییەی شێوازی ئەدەبی تێدا دیار بێ هێندەی دیاربوونی ئەو شێوازە ئەدەبییە گومان دەکەوێتە سەر نووسینی ئەو مێژووە. ئینجا ئێمە خۆمان ئەو شێوازە بەکاردێنین و وشەی زل زل فڕێ دەدەین، هەندێ مێژوونووس پێی وایە شێوازی جوان باشە، ڕاکێشانی بیر و هۆشی خوێنەوار دەبێ بە ناوەڕۆک و پتەویی دەرەنجامەکان بێ، نەک بە وشەی بریقەدار و زل زل، لە کتێبەکەمدا (بانگەوازێک بۆ ڕووناکبیرانی کورد لە پێناوی کۆکردنەوە و زیندووکردنەوەی کەلەپووری کوردیدا) کە مەنهەجێکە بۆ چەندین بواری بیرلێنەکراوە بۆ کەلەپووری شارستانی کورد، بۆ ڕۆشنبیری کوردی پرۆگرامێکی زانستیانەیە، تا لەسەر ڕۆشنبیری کوردی جێبەجێی بکەم لەم بوارەدا ڕەخنەم لە هەندێ کتێب گرتووە کە لاوازییان تێدایە، یەک لەوانە «دورالشعب الکردي في ثورة العشرين»ی دکتۆر کەمال مەزهەر، بەڵام بۆ حەقیقەت حەز دەکەم هەڵەیەکی خۆم باس بکەم کە لەوێدا وتوومە دکتۆر کەمال ئەمینە و ئاماژە بە سەرچاوەکان دەدات، دوایی بۆم ڕوون بووەوە ئەمە وانییە، چونکە نەک هەر ئەو کتێبەی تەحریفە بۆ بزووتنەوە کوردییەکانی ساڵی (١٩٢٠)، بەڵکو گومانیشی تێدایە، چونکە دکتۆر (محەمەد محەمەد ساڵح) وتارێکی لە ڕۆژنامەی (العراق)ی ژمارەی (١٦/١١/١٩٨٥)دا نووسی کە ئەو وتارە زۆربەی لە تێزی (خەلیل ئیبراهیم ئەحمەد) وەرگیراوە، ئەو کاتەش بڵاوی نەکردبووەوە، کە ناونیشانەکەی «ویلایة الموصل دراسة في تطوراتها السیاسیة (١٩٠٨- ١٩٢٢)» بووە.

هەروەها ئیسپاتی کرد کە لە ئەنجامی بەراوردکردنی عیبارەتەکان کتێبی دکتۆر «ڕۆڵی ئافرەتی کورد لە مێژوودا» کورتەیەکە لە کتێبێکی تر بەناوی «المرأة عبر التاریخ» کە دانەرەکەی (مونیک بیتەر)ە لە وەرگێڕانی (هنری عەبود) چاپی بەیرووت (١٩٧٩)، ئیتر ئەمە گومانی تێدا نییە کە دکتۆر محەمەد محەمەد ساڵح ئەم ڕاستییەی ئیسپات کردووە، منیش ئەوەی کە نووسیومە لە کتێبی بانگەوازدا لێی پەشیمانم و دیارە بە هەڵەداچووم. دکتۆر ئاماژەی بەسەرچاوە نەداوە، دوایی ڕەخنەیەکی دوور و درێژم لەسەر کتێبی (مێژوو)ی دکتۆر کەمال مەزهەر نووسی و لە نووسەری کورد ژمارە(١) خولی (٣) لە ساڵی (١٩٨٥) بڵاوبۆوە، دیسان لە ڕووی مەنهەجی لێکۆڵینەوەی زانستی ڕەخنەم لێگرتووە، هەندێ کەس بە وتارێکی وردیان زانی، تەنانەت

ڕەحـمـەتی (سـەبری بۆتانی) وتی: چوارده جـار ئەو وتارەم خـوێندۆتەوە، یەکـەمـجـار ئەو وتارەم بۆ گـۆڤـاری کـاروان نارد و مـامـۆسـتـا زوبێـر بیـلال ئیسماعیل شارەزای بوو، ڕاپۆرتێکی چاکی لەسەر نووسی، بەلآم سەرنووسەری گـۆڤـارەکـه برادەری دکـتـۆر بوو ئەم وتارەی قـبـوولّ نەکـرد و حـەوالّەی دکـتـۆرە شـوکـریە ڕەسـوولّی کـرد، ئەویش بەمنی وت هەلّـسـەنگاندنێکی جوانم لەسـەر نووسی کـە ئەم وتارە زۆر باشە، بەلآم هەلّـسـەنگاندنی ئەویشی قـبـوولّ نەکـرد، دوایی دایە (حوسێن ڕەشوانی) دیسان ئەویش پێی وتم ڕاپۆرتێکی زۆر جوانم لەسـەر نووسـیـوە کە شایانی بلاوکردنەوەیە، چونکە سەرنجی زانسـتی و ورد و جـوانی تێـدایە، بەلآم دیسـان لەدوای سێ ڕاپۆرتی باش بلاوی نەکـردەوە. با ئەمـەش بلّـێم کـە ئەو جـۆرە نائەمـینیـە زۆر لە گـۆڤـارەکـانی ئێـمـەدا بەهۆی برادەرێتی و تاقم و تـاقمکاریی پەیدا بووە کە ئەوە ڕێبەستن بوو لە سەلامەتی زانسـتی، هەروەها مـامـۆسـتـا زوبێر وتی فـلان وتاری دکـتـۆر کە هاتە لای ئێـمە خـۆی ئامـاژەی پێدابوو کـە بە عـەرەبی بلاوکـراوەتەوە، بە حـوسـێنم وت ئەمـە دکـتۆر خۆی ئاماژەی پێداوە کە پێشـتر بلاوی کردۆتەوە، ئیتر بۆچی ئێمە بلاوی بکەینەوە با ئەو شوێنە بۆ وتارێکی دیکە بێ، دەلّێ ڕاپۆرتی منی وەرنەگرت و یەکـسـەر ئەو وتارەی دکـتـۆری بلاوکـردەوە. ئەمـە نموونەیەکـە لە نائەمـینێـتی هەندێ کـەس کـە گـۆڤـارەکـانیـان کـەوتە ژێردەست زۆر ناڕاسـتی و نائەمـینییـان تێــدا دەکـرد و ڕێگر بوون لەبەردەم خـەلّکی تر، بگرە گــوناهێکە بەرانبــەر ڕۆشنبـیـری کوردی، مەسـەلەی زانست عـەشرەتگەری نییە، کـوڕە شار و کوڕە گەڕەکێ نییە، ئەمە یەکێکە لە گەندەلّییەکانی ڕۆشنبیریی ئەوکاتە، ئومێدەوارم دووبارە نەبنەوە.

لە زەمـانی بەعـسـدا زۆر ڕێگر هاتنە بەردەم وتاری باشی نووسـەران، دەیان وتـار دەدڕێنران و فــڕێ دەدرانە نـاو تەنەکــەی زبلّ، چونکە ڕقــیــان لە نووسـەرەکـانیـان بوو، بەتایبـەتی ئەو وتارانەی کـە ڕەخنە بوون لە نـووسـینی دۆستانی بەرپرسانی گۆڤار و ڕۆژنامەکان، هیوادارم گۆڤارەکانی ئەمڕۆ ڕێگە لە ڕاستی نەگرن، (د. کەمال مەزهەر) وەلآمی (د. محەمەد محەمەد سالّحی) نووسی بەناونیشانی «النقد بين الموضوعية و الذاتية» لە ڕۆژنامەی «العراق» ژمارەی ڕۆژی (١٢/١٢/١٩٨٥)دا بلاوکـرایەوە، بەلآم بە ڕاستی وەلآمێکی لاواز بوو بەرانبەر کتێبی ئافرەتی کورد کە ناڕاستەوخۆ دانپێدانانێک بوو، لە

وەڵامی ئەوی تریش «دور الشعب الكردي..» هەر لاواز بوو. من بۆیە زۆر باسی دکتۆر دەکەم چونکە لە هەمووان بەناوبانگترە و زۆر کەس وەک سەرچاوە پشتیان بە نووسینەکانی ئەو بەستووە، ئەمە لەوەی ئیبن خەلدوون دەچێ کە لە سەدەی چواردەی زاییندا بووە کە نووسیویەتی (الثقة بالناقلين)، متمانەکردن بە نووسینەکانی هەندێ کەس هۆیەک لە هۆیەکانی هەڵەکردنە، واتە دەبێ مرۆڤ ئەو متمانەیە نەداتە هیچ مێژوونووسێ، کە زانیاریی لێ وەردەگرێ دەبێ وریا بێ، باوەڕ ناکەم مێژوونووس هەبێ لە هەڵەکردن ڕزگاری بێ، بەتایبەتی هەڵەی ناڕاستەوخۆ نەک بە ئەنقەست، کەسێکیش هەڵەکەی بۆ ڕاستکردەوە نابێ بەرگری لە هەڵەی خۆی بکات، چونکە ئەم بۆ خودی خۆی نانووسێت، بەڵکو بۆ زانست و حەقیقەت دەنووسێ، دەبێ سوپاسی ئەو کەسە بکات کە هەڵەی بۆ ڕاست دەکاتەوە.

* پێت ئەوتێ سەرلەنوێ نووسینەوەی مێژووی کورد چۆن تێدەگەی؟

– هەندێ کەس کە بڕوایان بەسەرلەنوێ نووسینەوەی مێژووە، من پشتگیری لە ڕایەکەیان ناکەم، هەموو بابەتەکانی کورد نابێ سەرلەنوێ بنووسرێنەوە، چونکە مێژوونووسی زۆر گەورەمان لە کوردستاندا نییە تا ئەو کارە بکەن، بەڵام ئەگەر بەشێوەی ئەکادیمی بخوێنرێ وەک لە بەشی مێژووی زانکۆی سەلاحەدین و بەغدا و سلێمانی بۆ ئەو توێژینەوانە هەر قوتابییەکی ماجستێر و دکتۆرا بەسەرپەرشتیی لیژنەیەک بابەتێ بگرێ و لەبارەیەوە بنووسێ و پاشان موناقەشە بکرێن، ئەو جۆرە نامانە باشن لە هەر بابەتێ یەکێ سەبارەت بە بابەتێک بنووسێ چاکە، بەڵام سەرلەنوێ نووسینەوەی مێژوو لەگەڵی نیم، کاتی خۆی (سەدام) ئەم فیکرەیەی بڵاوکردەوە، هەندێ کەس هەر زوو پشتگیرییان کرد و هەندێکیش لە ترساندا تەئیدیان کرد لەوانە (تەها باقر) کە لە (١٩٦٣) زیندانی کرابوو لەترسی ئەشکەنجەدانێکی وەک ئەوکاتە بانگەوازی سەدامی پەسەند کرد، هەندێکیش ڕەفزیان کردەوە و لەسەر ئەوە لە زانکۆی بەغدا دەرکران وەک دکتۆر فیصل السامر، بۆیە ئەمە شتێکی ڕاست نییە، بەتایبەت ئەگەر لەژێر سەرپەرشتیی حزبێکی وەک بەعسدا بێ.

* ئەی بۆ بیرۆکەی دانانی ئەنسکلۆپیدیای کوردی چ دەڵێن؟

– بە نیسبەت ئەنسکلۆپیدیای کوردی، کە باسی لێوە دەکرێت، من گەشبین نیم بەم فکرەیە، چونکە ئەو توانا مێژووییەمان لە کوردستاندا نییە، بێگومان

ئەوکاتەی مێژوونووسانی باش پەیدابوون، ئەوکاتە دەتوانرێ بنووسرێت، بەڵام ئێستا ئەو هاوبڕوا و هاوڕاییە نییە تا چەندین جۆرە زانستی پتەو پێکەوە بنووسرێن، باوەڕ ناکەم کورد بتوانێ شتێکی وەک ئەوەی (دائرة المعـارف الأسلامية) بۆ مێژووی خۆی بنووسێت.

بۆ نموونە لە سلێمانی یەک مێژوونووسی تێدا نییە، هەروا لە هەولێریش، شێخ محەمەدی خاڵ و مامۆستا زوبێر بیلال هەبوون کۆچی دواییان کرد. تەنیا هەندێ مامۆستای زانکۆ لە بەشی مێژوو هەن و کەمیشن، ئەگینا لە کوردستان ئەمڕۆ میژوونووسمان زۆر کەمە، هەندێکیان لە دەرەوەن، یان لە بەغدان.

* پێت وایە بەهۆی کەلەپوور و فۆلکلۆرەوە بتوانین سوود لە نووسینەوەی مێژووی کورد وەربگرین، ئەگەر نموونە هەبێ؟

– یەکەم جار کە مێژوو نووسراوەتەوە لەسەر بناغەی دۆکیومێنت نەنووسراوە، یەکەم جار هیرۆدۆت کە مێژووی نووسیوە لەسەر گێڕانەوەی سەرزاری بووە کە ئەمانە ریوایەتی لاوازن. مێژوو و شیعری جاهیلی عەرەب بەزارەکی نووسراون، بۆیە تەها حوسێن ڕەخنەی لێ گرتن و پێی ڕاست نین.. شەرەفنامەش زۆر لەسەر بناغەی گێڕانەوەی سەرزاری نووسراوە، بەنیسبەت فۆلکلۆرەوە یەک لەو بابەتانەیە کە بۆ مێژوو سوودی هەیە، یەکێک لەو زانستانەی کە مێژوونووس کەڵکی لێ وەردەگرێ، چیرۆکی داستانئامێزە، لە کوردیدا قەولی (خانی دم دم)ی (فەقێ تەیران) هەیە. چیرۆکی داستانی یەک لەو بابەتانەیە کە مێژوونووس سوودی لێ دەبینێ، هەروەها فەلسەفە و یاسا و دارایی و زانستی ئینترۆپۆلۆژیا و جوگرافیا و زانستی سروشتی و کیمیا و جیۆلۆژیا و زانستی شوێنەوار و بەڵگەنامە و پارە و موادلیە واتە (نمیات) و (رنگ) و نومەیات و دروشمی دەوڵەتان و ئەدەب ئەمانە هەمووی زانستی هاوکارن بۆ مێژوونووس، هەروەها نەخش و نیگار و خۆشنووسی و هونەری بیناسازی، پێویستە مێژوونووس زانیاری لەبارەی ئەم هەموو بوارانەوە هەبێ، ئەم بوارانە هەموویان لەمێژوودا هەن، کە شتێک لەمانە دەکەوێتە بەرچاوی مێژوونووس پێویستە زانیاریی لەبارەیانەوە هەبێ، هەروەها فۆلکلۆری کوردی بەتایبەتی سترانی شەڕ کە لەبارەی شەڕوشۆڕی کوردە چ لەگەڵ خۆی، یان لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستان، ئەو سترانانە زۆر بە سوودن، چونکە وەک ئاشکرایە کورد مێژووی خۆی نەنووسیوەتەوە، زۆر لە میرانی کورد بەرهەڵستی

هێـزی بێگانەیان کـردووە بۆ مـانەوەی خـۆیان، ئەو هەمـوو ئازایەتی و قارەمانێتییەی نیشانیان داوە نەنووسراونەتەوە، بەڵام گۆرانیبێژان بە ستران ئەو مـێژووەیان پاراستووە، بەتایبەت ئەمە لە کـوردستانی باکوور لە هەموو پارچەکـانی دیکەی کـوردسـتـان زیاتر باو بووە، شـەڕێک دەبوو یەکـسـەر سترانبێژان گۆرانییان بەسەردا دەوت، یان هەندێ ڕووداوی گرنگ کە ئازایەتی تێدا بووایە بەشێوەی گۆرانی تۆماریان کردوون، باشترین نموونە بۆ بایەخدانی ئەم ڕووداوە مێژووییـانە کـتـێبی «سترانی کوردی»ی ئۆردیخانی جەلیلە کە بەهاکەی تەواو نابێ، ئەم زانایە چەند بەرگ مـێژووی بنووسیبا هێندەی ئەم کـتـێـبەی گرنگ نەدەبوو، ئەو شەڕانە لەگەڵ ڕۆم و عـەجەم و ناو خۆمـانیش ڕوویانداوە، زۆر لەو سترانانە بابەتی مـێـژووی گـەرمن و سـترانبـێـژان وەک مێژوونووس تۆماریان کردوون، لەم سترانانە وەک داستانی (تیلی حەمزە) کە شـەڕی لەگـەڵ تورک لە مـاکـۆ و بایەزید و ئەرزەڕوومـدا کـردووە، شـەڕی (عەشیرەتی زیلان) و (حەیدەران) لەگەڵ تورک، ئەو سترانانەی بەسەر (سەید خان) و (تۆفـیق)ی برای و (شێخ زاهیـر) و (شێخ عەبدولڕەحمان)ی برای و (فەرزەندە)ی سەرکردەکانی عەشیرەتی زیلان لە کاتی ڕاپەڕینەکەیاندا وتراون، سەیدخـان و فـەرزەندە و تۆفـیق، ئەمـانە لە قـارەمـانانی شۆڕشی ئاگری داغ (شۆڕشی ئارارات) بوون، ئەگەر ئەو سترانانە نەبوونایە ئەو مێژووە بزر دەبوو، ئەو ئازایەتییە باس نەدەکرا، ئەگەر ئێسـتـاش لەبارەیانەوە بپرسین زۆر کەس زانیـاریی لەبارەی ئەمـانەوە هەیە وەک خـۆشم لە خـەڵکی ئەو ناوچەیەم بیستووە، یان وەک لە سترانی (شەڕا ئاگری داغێ)دا هەیە.

ئەم سترانانە مێژوویەکی گرنگیان تێدایە، لەم سترانەدا هاتووە: (ئەسکەرێ عەلی عوسمان و نووری پاشا و زەکی بەگ و دەروێش بەگ و ئالاێ سێرتێ و فـرقا وانێ و تابۆورا بدلیسێ و یێ تورکێ دەشـتا مـوشێ و پێـخاسێ چیـای سـەرحەدی و عـەسکەرێ چەپەق چورێ، مـەجلیسێ یاز ڕوومێ داکەتا دەشـتـا موشێ، کەتە چەمێ بنانخێ و چەمێ سەرحەدێ و کەتە بەرئاڤا مورادێ و لە پەیاڤا سەلاحەدین دگەڕا لەتاقی باتێ سەید خان بە سێ دەنگان بانگی دکە لە عـەلیـمـانا گـەردن گـاز لە تۆفـیق لە سەڵاحـەدین دبێژە باب و برای من بوون مـێربوون مێرێ چی بن، ئیرو ڕۆژا مـێرانا..) ئەگـەر ئەمجۆرە سـترانانە نەبان بێگومـان ئەو هەمـوو بەرگری و خەبـاتە بزر دەبوون، بەرگری کردن لە شەرەف و

ناموس و وڵات.
شاگردی ڕەحمەتیم مەلا خەڵەفێ بافەیی شاسواری کەلەپووری کوردی لە کوردستانی باکوور لە ماوەی (١٠) ساڵدا زیاتر لە چوار هەزار لاپەڕەی لە کەلەپووری پەرشوبڵاو کۆکردەوە کە بۆ خۆی گەنجینەیەکی مەزنە، لەوانەش سترانی شەڕان.
لە هاوینی (١٩٧٧) کە چوومە کوردستانی باکوور بۆ سۆراخ و گەڕانێکی شوێنەواری و کەلەپووری، مەلا خەڵەف لە گوندی (ستەورکێ) تەنیشتی جزیرا بۆتان لەگەڵم گەڕا چووینە سەرکەلها بافێ، بینا ساردەکانی بینات و زێوێ فێنک و شوێنەوار و پەیکەرەکانی گوندی شاخ و هەبلەر لە چیای جودی، مەلا خەڵەفم هاندا بکەوێتە گەڕان بەدوای کەلەپووری کوردی، زۆر نامەم بۆ نووسی هەرچیم لەبیردابوو پێم دەوت تا جارێکیان نامەیەکی بۆ نووسیم و وتی تا ئێستا (٨١٤) لاپەڕە لەنامەکانی تۆ لای من کۆبوونەتەوە و هەندێکی نەماون. دەمنارده ئەو شوێنانەی کە خۆم دەمزانی و دەموت ئەمە بنووسە و ئەوە بنووسە. مەلا خەڵەف چالاک و چەلەنگ بوو، نموونەی وەک ئەو نەبوو، توانی زۆر بابەت لە کەلەپووری پەرشوبڵاو و زانیاریی مێژوویی و حیکایەتی مێژوویی دەربارەی میرانی بۆتان کۆبکاتەوە، سەرەتا بەناوی (گولڤەدان)ەوە بۆ منی دەنووسی، لە دەفتەرەکانیدا زۆر زانیاریی بۆ دەناردم، منیش بۆم نووسی مادەم ئەم زانیارییە زۆرەت کۆکردەوە تازە بۆ من نییە و هی خۆتە، خۆت دەبیتە نووسەر و کەلەپوورناس، کە مردیش وەسێتی کرد هەموو نووسینەکانی بۆ من بنێرن و هەموویان گەیشتنە دەستی من، لە دوو بەرگی گەورەدا فۆتۆکۆپیم کردن تا لەدەرەوە لە نامەخانەیەکی دەوڵەتی بپارێزرێن، بەرگێکی گەیشت، بەڵام بە داخەوە بەرگی دووەمی نەگەیشتووە، ئێستا هەموو نووسینەکانی لەلای من پارێزراون، ئەمانەتێکی گەورەیە لە ملی مندان. بۆم نووسی لە بارەی ئاوازی کوردی، ئەوانەی خەریکە لەناو دەچن ئەو ئاوازانە بە دەنگی سترانبێژانی بۆتان و تۆڕێ تۆمار بکات، پەنجا کاسێتی تژی کرد لە دەنگی ئەو سترانبێژانە و مێژووی ژیانی ئەوانیشی نووسیوە، ئەوەش بۆ خۆی سامانێکی پڕ بەهایە، بە داخەوە مەلا خەڵەف لە جزیرا بۆتان لە ڕۆژی (٣١/ گوڵان/ ١٩٩٣) کۆچی دوایی کرد، تا ئێستا کەس نەهات جێی مەلا خەڵەف ڕەمەزانێ بافەیی نەمر بگرێتەوە و سترانی شەڕ تۆمار بکات، سترانی بەرگری

کردن له شەرەف و نامووس و له خاکی ولات، چەندین جۆره سترانی وەک شەڕەکانی (عەلییێ بەتێ) که بووەته زەڕبولمسەل بۆ ئازایەتی، ئەمه پسمامی حاجۆیێ مزی زەخی بەناوبانگ بوو له دەڤەرا (طوریێ) له دەڤەرا نسیبینێ یەک له سترانەکانی ئەو شەڕێ (عەلییێ بەتێ) بوو که له نێوان مدیات و باژێڕێ نسیبینێ له چیای (باکۆکێ) له باکووری نسیبینێ لەگەڵ هێزی تورک کردی، (عەلییێ بەتێ) توانی لەگەڵ فەرماندەی خۆی (شەمعوونێ حەنێ حەیدۆ) که قارەمانێکی بەناوبانگی مەسیحییەکانی طوریێ بووه شاری نسیبینێ ئازاد بکات و دەرگای حەپسخانەکه بکاتەوه و هەموو ئەو کەسانەی زیندانی کرابوون بەڕەڵلا بکات. ئەم سترانانه هەموویان مێژووی گرنگن بۆ کورد و پێویسته کۆبکرێنەوه، بەلام خەڵەفێکی دیکه له کوێ بێنم.

پێویسته لەسەر ڕۆشنبیرانی کورد وەک (ئۆسکارمان) بەیت و ستران و حکایەت و پەند و ئەفسانەی کوردی کۆبکەنەوه، بەداخەوه زۆر له نووسەرانی کورد هەر خوویان دابووه شتی لاوەکی و بێکەڵک و ئاسان، کەلەپووری پەرشوبلاویان کۆنەدەکردەوه کەمێکیان نەبێ، لێرەدا ئاماژه به چالاکی (حاجی جەعفەر) دەدەم له دهۆکێ، هەروەها خدرێ پیر سلێمان و خەلیل جوندی له نووسەرانی یەزیدی، ئەم دووانه برێکی باش له پەند و قەولی ئێزیدیان کۆکردەوه که به حەقیقەت ئاوێنەیەکی سافن بۆ مێژوو و ئایینەکەیان، ئەم جۆره فۆلکلۆره مێژوویەکی مەزنه بۆ کورد، ئەگەر مێژوونووس هەمووشی به تەفاسیل وەرنەگرێ، یان جائیز نەبێ وەرگرێ، ئەوه کورته و خولاسەی ناوەرۆکیان کەڵکی لێ دەبینرێ و ڕووداوەکانی مێژوویان پێوه دیاره، هەندێ لەو بەیتانه هی سەدان ساڵ لەمەوبەرن، وەک بەیتی (زەمبیل فرۆش) که هی سەدەی یازدەی زایینییه، پەندی مەلیک تاووس و شێخ حوسێن و پیر شەرەف ئەمانه هەموویان کۆنن و هی سەدان ساڵ لەمەوبەرن، (قەولی میرزا داسنی) که له سەدەی حەڤدەیەمدا میری داسنیان، (ئێزیدیان)، (داسنی میرزا) زۆر شەڕکەر و ئازا بووه، شەڕی لەگەڵ ئێران کردووه و بەشداری لەگەڵ سوڵتان موڕادی چوارەمی کردووه بۆ داگیرکردنی شاری بەغدا له (٣)ی شەعبانی (١٠٤٨)ی هیجریدا زۆر مێرخاسی لەو شەڕەدا نیشان داوه، وەک له (تاریخ العراق)ی عەباس عەزاوی بەرگی پێنجدا هاتووه، هەروەها (تاریخ نعیما) بەرگی پێنجەم که تورکییه، داسنی میرزا توانیویەتی لەگەڵ حەوت شەڕکەری خۆی

سەدان قزڵباشی ئێرانی بکوژێ، لەبەر ئەم ئازایەتییە کرایە والی مووسڵ، بەڵام لەبەر ئەوەی ئێزیدی بوو میرانی دیکە کە موسڵمان بوون پێیان ناخۆش بوو، ئیتر دەوڵەتی عوسمانی لەو پلەو پایەیە لایدا کە (١٠٥٩- ١٠٦١) بووەتە والی مووسڵ، پاشان کە ئەم پلەو پایەیەی لێ سەنراوەتەوە لەگەڵ جەماعەتێکی شەرکەری خۆی بۆ ئەستەنبووڵ چووە تا لەوێ دەوڵەت شوێنی تری بداتێ، لەوێ بە دڵشکاوی گەڕاوەتەوە و لە ناوچەی ئەنادۆڵ دیارە هەندێ شتی دژی دەوڵەت کردووە، لەشکری دەوڵەتی عوسمانی ڕێی لێگرتووە و لە شەڕێکدا خۆی و پیاوەکانی کوژراون، سترانێ دەربارەی داسنی میرزا لە پاشکۆی عیراق ژمارە (٤٤) ساڵی (١٩٨١) بڵاوبۆتەوە، ئەوەی بڵاوی کردۆتەوە «ئەرجان ماری» نووسیویەتی ئەم سترانە کۆنە و زانیاری مێژوویی تێدا هەیە، باس لە قارەمانێتی و ئازایەتی میرزا دەکات لە داگیرکردنی بەغدا کە دەڵێ: «گەنج عوسمان لای مێژوونووسان بەناوبانگە کە شەڕێکی زۆر گەورەی لە بەغدا کردووە، لەو هێرشەدا هەردوو دەستی هاتۆتە بڕین، لە شەڕەکەدا کە دەستێکی بڕاوە بەوی تر شەڕی کردووە، ئەوەیشی پەڕیوە، ئینجا کوژراوە».

سترانبێژ دەبێژێ (چاکی وەک گەنج عوسمان لەناوماندایە لە بەغدا سەری ئەو هاتە بڕین بەسەر و کڵاوەوە)، ئینجا لێرەدا ئاماژە بەوە دەدات کە پێشتر داسنی میرزا شەڕێکی لەگەڵ ئێران کردووە، دوو برای لەو شەڕەدا کوژراون کە حەیدەر و عومەرن. ئەگەر ئەو سترانە نەبوایە مێژوو ناوی بە دەرنەدەخست، ئەمە یەکێکە لە قازانجەکانی سترانی شەڕان، کاتێ ئەو برادەرە لە پاشکۆی عێراق بڵاوی کردۆتەوە، وشەی (مووسڵی) سانسۆر کراوە، لە گۆرانییەکەدا هاتووە: «ئەز دەترسم پشتی ئێمە بکەونە دەستی چەقاڵ و بەقاڵی مووسڵیان»، وشەی مووسڵیان لە ترسی حکومەت ڕەش کردووەتەوە، ئەم سترانە بەڵگەیە بۆ گرنگی سترانان کە ئەمانە سەدان ساڵ لەمەوبەر گەرچی هەندێکیان لێ بزر بووە، بەڵام کۆکردنەوەیان بەشێکە لە مێژووی چەند سەد ساڵەی ڕابردوو.

لێرەدا حەز دەکەم هەڵەیەکی خدری پیر سلێمان و خەلیل جوندی ڕاست بکەمەوە لە کتێبی (ئێزیدیاتی)دا کە قەولی (شیش مسی) ئێزدی بەناوی قەولی (شیش مسی تەورێزی) هێناویانە لە لاپەڕەی (١٢٩- ١٣٠) وایان

زانیوه هی شەمسی تەبریزییە، ئەمیان شێخی (جەلالەدینی ڕۆمی) بووە (محەمەدی کوڕی محەمەد) خەڵکی (بەڵخ) بوو، لە قۆنیە لە ساڵی (١٢٤٦ز) کوژراوە، جەلالەدینی ڕۆمی خۆی (دیوانێ شەمسی تەبریزی) بەناوی ئەوەوە کردووە، ئەم قەسیدەیە کە ئاماژەم پێدا مەبەست لە شێخ شەمسی ئێزیدییە، ئەمە جودایە لەگەڵ شەمسی تەورێزی و ماناشیان جودایە. هەروەها ئەم دوو نووسەرە دیسان لە لاپەڕە (١٢٧) تووشی هەڵە بوونە، شێخ شەمس گەورەی عەشیرەتی شەمسانی یەزیدی بووە کە لەسەر ئایینی کۆنی یەزیدیا (میترایی) بووە لەپێش ئەوەی شێخ ئادی بچێتە لالش، شەمسی تەبریزی نییە، ئەگەرچی ئەمەشیان زانیوە، بەڵام دەبووایە ڕوونکردنەوە لەم بارەیەوە بنووسن، ئێزیدیان لەنێوان هەردووکیان (إلتباس)یان کردووە.

* لەلای تۆدا تەکنەلۆژیا و کەلەپووری میللی بۆ پاشەڕۆژ چۆن دەستنیشان دەکرێت؟

- تا تەکنەلۆژیا و کۆمەڵی کوردەواری بەرەو پێش بچێت شوێنەوار و کەلەپوور و مێژوو بەرەو گەشەسەندن دەچن، میللەتی دواکەوتوو تەکنەلۆژیاشی نییە و بیر لە کەلەپووری شارستانی خۆی ناکاتەوە، وەک پێویست بیر لە زیندووکردنەوەی کەلەپووری دێرینە ناکرێتەوە، ئەگەر وا بمێنێ ئەو میللەتە کەلەپوورەکەی لەناودەچێ، ئێستا پێویستە کۆی بکاتەوە و زیندووی بکاتەوە، بەڵام ڕۆشنبیرانی کورد کەمتەرخەم بوون و ئەو بیرەیان نەبوو.

* بەڕای تۆ چی بکەین هەتا زووە زمانەکەمان لە شێواندن ڕزگار بکەین؟

- ئێستا زمانی کوردی لە قۆناغی پاکبوونەوەیە، چونکە بیری نەتەوایەتی بەرەو پێش چووە و ڕۆشنبیر زۆر بوون، نووسین و دانان بەرەو پێش دەچێت و زیاتر لەسەر زمانی کوردی دەنووسرێ وەک لە کەلەپووری کوردی، ئەمە بەستراوە بە بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردستان تا ئەو بزاڤە بەرەو پێش بچێ زمانیش بەو شێوەیە ڕەوان دەبێ و هاوشانی پێشکەوتنی بوارەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی دەڕوات.

* پێت وایە لە زمانە کۆن و دێرینەکانی هۆزەکانی کوردی کۆن خوری و ئورارتو و کاشی و سوباری و میتانی و گوتی و میدی و لۆلۆ دەتوانین بۆ مێژووی زمانی کورد بەهرە وەربگرین، چۆن؟

- ئەو زمانانە لەدواڕۆژدا دەردەکەون، کە شوێنەوار لە کوردستان دەپشکنرێ

و زۆربەیان لەبن زەوی مــاون و نەدۆزراونەتەوە، دەتوانین ســوود لە واژە و موفـرەداتی ئەوانە وەربگرین و زمـانـی کـوردی پێ دەوڵەمـەند بکەین، زۆر لە وشەکانی کاتی ئەوان ئێستا لە زمانی کوردیدا زیندوون و بەکاردێن، بۆ بەهرە وەرگـرتن لەوە ئامـاژە بۆ هەردوو کـتـێـبی بەرێز (د. جـەمـال رەشـیـد) (لێکۆڵینەوەیەکی زمـانەوانی دەربارەی مـێـژووی وڵاتی کـوردەواری) و (دراســات کــوردیة فی بلاد سوبارتو) دەدەم کـە پڕ بەهان و سـوودیان لێ وەردەگیرێت، چونکە دکتۆر لەو بارەوە زۆر ماندوو بووە.

ئێستا سەدان وشەی سۆمەری لەزمانی کوردیدا هەن، لیستەم بۆ ئەمانە دروست کـردووە، کـە لە رێگای رۆشنبـیـریـیـەوە ئەم وشـە سـۆمـەرییـانە بڵاونەبوونەتەوە، وەک دەبینم وشە و واژەی عەرەبی و فارسی و تورکی بەهۆی ژێردەستی ساڵانی دوور و درێژی کوردستان و بەهۆی فەرهەنگی ئەو زمانانەوە خزاونەتە ناو زمانی کوردییەوە، بەڵام هی سۆمەری بەو شێوەیە نەبووە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سۆمەری خەڵکی کـوردسـتان بوون و زمانی ئەوان لە زمان، یان زاراوەی گوتی و لۆلۆیی نزیک بووە، یان یەک زمان بووە یان وەک زاراوەیەک لە زاراوەکانی کوردستان بووە، سۆمەرییەکان لە کوردستانەوە رۆیشتوون، شوێنەوارناسی گەورە (تەها باقر) خۆیشی ئاماژەی پێداوە کە سۆمەری لە شوێنی دوورەوە نەهاتوونەتە عیراق، بەڵکو لە ناوچەی شاخاوی ناو سنووری عیراقی ئێستاوە هاتوونەتە باشووری عیراق، واتە لە چیاکانەوە چوون، بۆ نووحیش ئەگەر یەکێک بڕوای بە لایەنی ئایینی لاوازیش بێ، دەتوانین کەڵک لە مێژوو وەربگرین کە حەقیقەتی هەبووە، بۆ ئەم مەسەلەیە تەنانەت سۆمەری و ئەکەدی و ئاشوورییەکان بەسەرهاتی (طوفان)یان تۆمار کردووە، ئەمە نیشانەی ئەوەیە نووح شەپۆلێکی دیکە پێش سۆمەری لە کوردستانەوە چووەتە ناوەند و باشووری عیراقیان ئاوەدان کردۆتەوە، یان هەر لە شەپۆلی سۆمەری خۆی بووە، لەکاتێکدا لە کۆتایی هەزاری شەشەمی پێش زایین ئاوەدانیی تێدا نەبووە، دوای ئەوە نووح مەسەلەی تەوژمێکی ترە لە مرۆڤایەتی کە لە کوردستانەوە چوونەتە باشووری عیراق و جارێکی دیکە گەڕاونەتەوە کوردستان، پاشان شەپۆلێکی دیکە دیسان چوونەتە عیراق لە کوڕ و نەوەکانی نوح و هیچ دوور نییە نووح خۆی لە کوردستان کۆچی دوایی کردبێ وەک لە چەندین شوێن جێ مەزاری هەیە.

لەناو (مزگەوتی نەبی نووح) لە شاری (جزیر) و لە (جیما) لە پشتی باژێڕی (سلۆبی) لە دامێنی جوودی، هەروەها لە دامەنی چیای بێخێر کە چووم وێنەم گرت، وابزانم زیاتر لە بیست شوێن لە ناوچەی زاخۆ و جزیرا بۆتان ناوی نووحی پێوەیە کە مامۆستای گەورەم زانای مەزن ڕەحمەتی (مەلا مەحموودی هوسەری) و موفتی جزیرا بۆتان کتێبێکی لەو بارەوە بە زمانی تورکی داناوە، کە مامۆستا چووە سەرچیای جوودی ئەوەش بەهۆی نامەکانی منەوە بوو کە نامەم بۆ دەنارد و داوای دۆزینەوەی چەندین شوێنی شوێنەواریم لێدەکرد، ئیتر ئەوە لەگەڵ شێخ محێدینی برازای شێخ شەرەح بیل وەک شێخ محێدین خۆی بەمنی وت لە (١٩٧٧)دا کە مامۆستا موفتی پێی وتبوو: با لەسەر داوای عەبدولڕەقیب یووسف سەفەرێ بکەین بۆ چیای جوودی و جێگەی کەشتی نووح ببینین، بەڕای من جێگەی کەشتی نووح لەسەر چیای جوودی پەرستگایەکی کۆنی گوتییەکان بووە، ئەوە زۆر گەورە و گرنگ بووە، میللەتانی ناوچەکە هاتووچۆیان کردووە و خەسڵەتێکی پیرۆزی وەرگرتووە، ئینجا چ نووح خۆی دامەزرێنەری ئەوە بێ لەسەرەتاکانی هەزاری سێیەمی پێش زایین، یان پێش ئەو مێژووە، یان هەندێکی دیکە، ئیتر بەهۆی نووحەوە خەسڵەتێکی تەقدیسی وەرگرتووە، لەلای مەسیحییەکان هەروا لە لای ئیسلام و هەموو ئایینەکانی تریش تەنانەت یەزیدی و یەهودییەکانیش هەموویان دەچوونە سەر چیای جوودی و پێیان دەوت (حەفتیا جودی) کە ناوبانگی لە بۆتان هەیە، حەفتەیەکی تایبەت هەبوو بۆ ئەوەی خەڵک بچنە سەر چیای جوودی و دەیانووت ئەمە جێگەی کەشتی نووحە، لەوێدا ئێستاش تەختەدار و پارچە قیر هەن، لەبەر ئەوە وتوویانە ئەوە هی کەشتی نووحە.

مامۆستای کۆچکردوو (تەها باقر) لە کتێبی (ملحمة گلگامش)دا نووسیویەتی ڕیوایەتی (بیروسوس) لە بارەی تۆفانەوە «بیروسوس» کاهنێکی بابلی بووە، لە سەدەی سێی پێش زایین کاهنی گەورەی پەرستگای مەردۆخ بووە، ڕەنگە ناوی بەرعوشا بووبێ و چووەتە وڵاتی یۆنان لە دوورگەی (تووس) قوتابخانەیەکی بۆ خوێندن دروست کردووە، هەندێ دەڵێن هاوچەرخی ئەسکەندەر بووە، ئیتر بە یۆنانی ڕۆمانی تۆفانی نووسیوە، لە ڕۆمانەکەیدا هاتووە کە نووح پەرستگایەکی لەسەر چیای «کوردیان» واتە گوتی دروست کردووە کە جوودییەو لە وڵاتی گوتییەکان بووە، بیروسوس لە «ئەتراحاسیس»

واته له ڕۆمانی تۆفاندا نووسیویەتی (بەشەکانی کەشتی) ماوه که تەختەداری قیرکراون و خەڵک قیری لێ دەهێنن، ئێستاش ئەو تەختەدارانەی کە قیری پێوەیە لەسەر چیای جوودی دەبینرێن، وا دیاره پەرستگایەکی زۆر گرنگ بووه و تەختەدارەکانیان بەقیر بەیەکەوه نووساندووه، یان کراسیان پێ دروست کردووه تا نەرزێن، لەم کتێبەی تەها باقردا لاپەڕەی (٤٦، ١٤٣، ١٥٥، ١٥٨) چەند جارێ ناوی شاخی (نسیر) هاتووه، هەندێ وایان زانیوه شاخی پیرەمەگروونه له خۆرهەڵاتی (زێی بچووک) که ئەمه ڕاست نییه، بەڵام (نسیری) ئێستاش ناوی ماوه که دەکەوێته خوار جوودی له دەشتی سلوپی له کەنار ڕۆژهەڵاتی دیجله، ئەو ناوچەیەش هەر به (باسۆرین) ناوبانگی هەبووه که زۆر ناوی باسۆرین له سەرچاوەی عەرەبیدا هاتووه که دراوسێی ناوچەی پیشخابووره وەک له (معجم البلدان) و هی تردا هەیه، (چیای نسیری) هەر چیای جوودییه که له باکووری دەشتی سلۆپیایه، ئەو ناوچەیەش لەپێش ئیسلام بەناوچەی (قەردو) ناسراوه و له سەرچاوەی سریانیدا بووه به (قردا) و (باقردا).

دیسان مەلا خەڵەفی بافەیی یەکەم کەس بووه که شوێنەواری شاری (قەردۆ)ی لەژێر جوودی دۆزییەوه له نزیک گوندی (گرێ چۆلیا) کاتێ ساڵی (١٩٧٧) لەگەڵ مەلا خەڵەف چووین بۆ بەشێکی جوودی هیچمان لەبارەی شوێنی شاری (قەردۆ) دەست نەکەوت، من دوایی هانم دا زیاتر ئەو ناوچەیه بپشکنێ، دواتر چووه جێی ئەو باژێرە خراپه و یەکسەر لەژێر جوودی له باکووری سلوپی دۆزییەوه، کە ئەمەش دۆزینەوەی مەلا خەڵەفی بافەییه له وەختێکدا (قەردۆ) بووەته ناوی هەموو بۆتان، یان ناوچەیەکی فراوانتریش وەک زاراوەیەکی جوگرافی، به (کوردۆئین) هەمان ناو هاتووه، هەندێ دەڵێن وڵاتی کوردۆئین وەختێ وڵاتی بووه قەڵەمڕەوەکەی تا دیاربەکر چووه، ناوچەی جوودی که مەڵبەندی (کوردۆئین) بووه. ناوچەیەکی شارستانی پڕ شوێنەوار بووه، حەوت پەیکەری ئاشووری له گوندی (شاخێ)ی نێو چیای جوودی هەیه، وێنەی زۆربەیانم گرتووه، لەگەڵ مسمارییەکی زۆر و وێنەی پەیکەری خوداوەندێکی کوردەکانی کوردۆئین (شاخ) ئەو وەخته پایتەختی ئەو ناوچەیه بوو، یان بڵێم هەرێمی کوردۆئین که حەوت شوورەی هەیه، وێنەم گرتووه و له کتێبێکمدا به ناوی «گەشتێکی ئەرکیۆلۆژی بۆ کوردستانی باکوور» تەفاسیلی

هەمـوویانم نووسـیـوە، پاش ئەوە کـە دەوڵـەتی ئەشکانی هات (١٢٧پ.ز تا ٢٧٧پا. ز) مەڵبەندی بۆتانیان کردە بازێڕی (فنک) کە دەکەوێتە ڕۆژئاوای جوودی لەناو (چیایێ ڕەش)، کە زنجیرە چیایەکە دەگاتەوە جوودی و نێوانیان تەنیا لەپشت جزیرێ ئاستەنگا قەسرکاگێلی هەیە، لەوێش پەیکەرێک هەیە و سێ پەیکەری ئەشکانیش لە (فنک) هەیە، هەندێ مێژوونووسی کاتی ئیسلام ناوچەی زاخـۆ بەناوچەی باسـۆرین دەژمـێـرن، ئەگـەرچی کـەوتووەتە ئەمـبـەری خابووریش، پوختەی تۆفانی نووح ئەوەیە کە شەپۆلی دووەم لە کـوردستـانەوە بەرەو عیراق چووە و لە دوای لافاوەکە ئاوەدانیان کردۆتەوە، کوڕەکانی نووح و خەڵکی تر لە وڵاتی گوتییـەوە چوونەتە عـیـراق کە دوور نـیـیـە ئەوە شـەپۆلی یەکەم یان دووەمی سۆمەری بێ و پێش سۆمەرییەکان شەپۆلی یەکەمی مرۆڤ لە کوردستانەوە چووبن و عیراقیان بۆ یەکەمین جار ئاوەدان کردبێتەوە.

* هەندێ دەڵێن ڕووخـانـدنی مـیـرنشـیـنە کـوردەکـان لە بەرژەوەندی کـوردان بووە، ئەی تۆ دەڵێی چی؟

– ئەمە ڕاستە، چونکە میرنشینە کوردەکان یەکیان نەدەگرت، کە مـیـرێکی کـورد هاتبـایە شـۆڕشی بکردایە ئەوانی دیکە هەمـوو بە هاندانـی وڵاتانی وەک ئێران و سەڵتەنەی عوسمانی لەگەڵ هێزی بێگانە دەچوونە سەر میرنشینەکە و لەناویان دەبرد. ئەو مـیرنشینانە کۆسپ بوون بەرانبەر بە یـەکگرتنی کورد، کە ئەوانە نەمـان کورد زیاتر لەیەکـتر نزیک بوونەوە و بیری نەتەوایەتی گەشەدارتر بوو و ئێستا بەرەو ڕزگاری دەچێت.

* گـەلێ لێکـۆڵـینەوەی خـێـرا و سـەرپێـیی لەناو گـۆڤـارەکـاندا سـەبارەت بە مێژووی کورد بڵاودەکرێنەوە، بەڕای تۆ ئەمەیان چ خزمەتێکی تێدایە؟

– زانیـاری لاوازی زۆر لە گـۆڤـار و ڕۆژنامـەکـاندا بـڵاودەبنەوە، پێـویـسـتـە لەمەولا وتاری مێژوویی کە دەچێتە لای گۆڤارەکان ڕەوانەی لای مێژووناس و زانایەکی باشی بکەن، تا بەدیقـەت بیـخـوێنێتـەوە و بەخـێـرایی ئەو وتارانە بڵاونەکەنەوە و هەڵیبسەنگێنن، ئەگەر شایستە بێ ئینجا بڵاوبکرێتەوە، وەک چۆن دەبێ هەر مـادەیەکی تریش وەها بێ بڵاونەکـرێنەوە، تا وەک ئەو وتارە تەحـریـفـیـانەی لێ نەیەت کـە مـێـژووی سـەلاحـەدین و ناوچەی هەولێـری شێـواندووە، لە کـاتێکدا ئەسـڵـەکـەی خـەڵکی (دوین)ی ئەرمـەنسـتـانە کە دەکەوێتە ناوچەی ئیریڤان نەک (دوین)ی هەولێر، هەندێ کەس دەڵێن: بۆچی

ڕێگە دەدرێ بەم تەحریفە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بلاوبێتەوە؟
* دەربارەی ئەو نەخش و نیگارانەی لەلایەن تۆوە دۆزراونەتەوە لەبارەی بیناسازی کە لەو هونەرەدا بەکارهاتوون، پێت وایە بتوانین بۆ ئەمڕۆ سوودیان لێ وەربگرین؟
- بابەتی نەخش و نیگار بەشێوەیەکی گشتی کە لەناو خانووبەرەدایە لە کوردستان ژمارەیەکی زۆر هەبوون، هەندێ لەو خانووبەرە بە نەخش و نیگارانە لەلای خاوەنەکانیانەوە وێران کراون، هەیە لای کەسانی دەوڵەمەندەوە دەکڕێن و دەکرێنە دوکان و گەراج و بازاڕ، وەک لەسلێمانی یەکێک هەیە بەناوی (زاهیری کەریمە ڕەشی سوخۆر)، ئەمە تا ئێستا سێ بینایەی کەلەپووری ڕووخاندووە، (دەرگا)ی یەکێکیشیان بە ئیزنی کاک جەمال عەبدولی وەزیری ڕۆشنبیری پێشوو ڕووخاند، هەرچەندە پێم وت ئەم واجیهەیە نموونەی تری لە سلێمانی نییە، مەهێڵە بڕووخێنرێ، بەڵێنی دا بەلام دوایی کابرا هات و وەزیری دایە دوای خۆی بۆ پشت شەقامی کاوە، ئەویش پێی وت بیڕووخێنە، منیش شەش (٦) لاپەڕەم بۆ نووسی و موقاطەعەی وەزیریشم کرد، پێم وت تا ئێستا تۆ نە خشتێ نە بەردێکت لە بینایەکی کەلەپووری لە کوردستان نەپاراستووە، چۆن توانیت فەتوای ڕووخاندنی واجیهەیەکی کەلەپووری بۆ زەلامێکی دەوڵەمەند بدەی؟ مەسەلە لێرە دوور و درێژە تا گەیشتە ئەوەی لە وەزیفەکەم دەست لە کار بکێشمەوە.
پێویستە ئەم بینایانە بپارێزین، چونکە سەرچاوەی بیناسازی و نەخش و نیگاری کوردین و نموونەی زۆر جوانی لە کوردستان هەیە و دەتوانین زیندوویان بکەینەوە، لە نوێترین نەخشەی بینای نوێ ئێستا خەڵک ڕوویان کردووەتە نەخش و نیگاری مەغریبی، لە کاتێکدا هی ناو ماڵە کۆنەکانی خۆمان جوانترن. لە زۆربەی شارەکانی کوردستان زۆر نموونەی ئەو خانووانە هەیە. دەست پێکردنم بۆ ئەو بابەتە دەگەڕێتەوە بۆ تەمموزی ساڵی (١٩٧٧) کە خانووی نەخشدارم لە شاری (مدیات) بینی. دواییش دەستم کرد بە وێنە گرتنی نەخش و نیگاری خانووەکانی کوردستانی باشوور، ئیتر زانیاری زۆرم لەسەر وەستا و بەنا و نەقاش و دارتاش و مێژووی دروست بوونیان کە مێژووی ئەو هونەرە جوانەیە بلاوکردەوە، لە (١٩٧٩-١٩٨٠) دوو لیستەم دایە دەزگای شوێنەواری گشتی لە بەغدا. دوایی لیژنەیەکی دەزگای شوێنەوارم

هێنا بۆ کۆیە و هەولێر و هەڵەبجە و سلێمانی، حکومەت قەڵای هەولێری پشکنیبوو و هەندێ خانووی تێدا ئیستملاک کردبوو، دەتوانم بڵێم (٧) هەزار وێنە لە کۆی ئەو (١٦) هەزار وێنەیەی کە لە بواری شوێنەوار و کەلەپووری کوردیدا گرتوومن هی ئەم خانووانەیە، تا لە کۆڕەوەکەی دوای ڕاپەڕین توانیم (٥٤٠) وێنەی ئەم خانووە کەلەپوورییانە لە ناو شاری (سنە) بگرم، من لەم بابەتەدا یەکەمین دەستپێشکەر بووم کە وتاێکم لەم بارەیەوە بڵاوکردەوە و (٩) کەڵک و قازانجم لەو وتارەمدا بۆ ئەم بینا کەلەپوورییانە نووسیوە، وەک هونەری بیناسازی کوردی و هونەری نەخش و بواری مێژوویی و کاری سینەمایی و شانۆیی و لێکۆڵینەوە لەبارەیان بۆ زیندووکردنەوەی کەلەپووری بیناسازی و لایەنی گەشتوگوزاری و زیندووکردنەوەی ناو و کاری وەستا و بەنا و نەقاشەکان تا ئەم خانووانە بۆ ئەم کەڵکانە بپارێزرێن، ئەم وتارەشم لە بڵاوکراوەی (ئەشکەوت)دا بڵاوکردەوە کە هی قوتابیانی کۆلێژی ئەندازەی زانکۆی سەلاحەدین بوو، لە تشرینی یەکەمی (١٩٩٧) زۆر لەم خانووانە لە کوردستان نەمان و خەڵک کەوتنە ڕووخاندنیان، بۆ نموونە قەسری (عەتاولا ئاغا) لەنزیک دوڕیانی سێتاقان لە شاری هەولێر بەناکە وەستا (خەلیل سلێمان)ی هەولێری بوو، بیناسازێکی گەورە بوو، چەند ئەستوونێکی ئەنتیکەی لەبەر هەیوانەکەدا دروست کردبوو، ئەم خانووە خشتەکانیشی بەشێوەیەکی نا شەرعی (حاجی ڕەشید ئاغای) باوکی عەتاولائاغا لە گردی (سەعد ئاوا) هێنابوو، ئەمە گردێکی شوێنەوارییە کە موڵکی ئەو بووە، نووسینی مسماری لەسەر خشتەکان هەبوون، ئینجا چ بەنووسین و چ بەدەم چەندین جار دائیرەی شوێنەواری هەولێرم ئاگادار کردەوە تا بیپارێزێ، عەزیز طوبیایی نەقاش کە سریانی بووە و لە (١٩٥٤) کۆچی دوایی کردووە بە بۆیاخ دروستی کردووە و لە چەندین خانووی هەولێردا نەخش و نیگاری ماوە، لە شوباتی (١٩٨٠)دا لیژنەی شوێنەوارم هێنا ڕاپۆرتیان دایە دەزگای شوێنەواری گشتی و بە خاوەنەکانیشیانم وت ئێمە دەیکڕین و دەیکەینە مۆزەخانەی هەولێر، وەرەسەکانی چاوچنۆک بوون، بڕوایان نە بە کورد و نە بە کەلەپووری شارستانی نەبوو، داوای نیو ملیۆن دیناریان کرد کە بۆ ئەو وەختە زۆر زۆر بوو، وەستا بەکری وەستا مستۆ دارتاشی هونەرمەند کە ئەو هونەرە مەزنەی لە وەستا مستۆی باوکی وەرگرتبوو، زیاتر لە بیست دەرگای دارگوێزی

لەو خانووە گەورەیەدا بە چەندین جۆرە نەخشی جوان و بەشێوەی حەفر «کۆڵین» دروست کردبوو، هەروەها بەشێوەی موتوربە «تطعیم» کردن بە داری نارنج و ئابنووس کردبوونی، من وەستا (عیزەتی دارتاش) کە شاگردی ئەو بوو بینیم وتی وەستا بەکر ئەو دەرگا دارانەی لە ماوەی پێنج ساڵ دروست کردووە، بە داخەوە چەندین جار بە نووسین و بەدەم بە دائیرەی شوێنەوارم وت ئاگاداری ئەو خانووە بن، من لە (١٩٧٩) چوومە سەری و وێنەیم گرت، دوای ئەوە چەندین جار چوومە سەر خاوەنەکەی کە ئاگاداری بن، ساڵانی پاش راپەڕین خانووەکە ڕووخێندرا و کرا بە گەراجی (کۆیە- هەولێر)، ئەو هەموو دەرگا دەگمەنانە لەناوچوون، گوناحەکەش لە ملی دائیرەی شوێنەواری هەولێرە کە ئەو هەموو کەلەپوورە لەناوچوو، لە کاتێکدا دەیانتوانی دەستی بەسەردا بگرن، چونکە ئەوانە خانووی مێژوویین و نابێ بڕووخێن، پاش دوو ساڵ دوای ڕووخاندنی پاش راپەڕین کە زانیم چوومە شوێنەکەی لە هەندێ کەسی ئەوێم پرسی «کوانێ ئەو دەرگا دارە بە نەخشانە؟» وتیان «نازانین» چوومە لای دارتاشەکان گەڕام، لای ئەوانیش نەبوو، تومەز دز و جەردە و قاچاغچی ئەو جۆرە دەرگایانە کە پاش راپەڕین پەیدا ببوون بەدزییەوە دەیانبردنە مووسڵ و بەغدا، بۆیە هیچ ئەسەرێکی ئەوانەم لای دارتاشەکان نەدۆزییەوە، بە ڕاستی ئەمە زیانێکی گەورە بوو، هەروەها مستۆش چەندین دەرگا و شتی دیکەی لە دیوەخانەی میرانی قادر بەگ دروست کردبوو کە دەکاتە باوکی عوسمان میران لە شەقلاوە، کە لە سەدەی شازدەیەمدا لە شوێنی دیوەخانەی میر سلێمانی برای خانزادی سۆران بووە، وێنەی ئەوانەشم چەند جارێ گرتبوو لە ڕۆژنامەش لە سەریم نووسی و نوسخەم پێدان و زۆر داوام لێیان کرد بیپارێزن، لەسەر ئەشکەندەری (دەڕابە) بە گەورەیی و بە پانی و درێژی (٣م) و هەژدە جۆرە نەخشی بە هەڵکۆڵین لەسەر کۆڵیبوون، ناوی خۆیشی لەسەر نووسیبوو لەگەڵ ناوی سەعیدی کوڕی، کاتی خۆی وەستا سەعیدم بینی و لێم پرسی و ساڵی (١٩٢٦)ی لەسەر بوو. پارو پێراریش بە وەزارەتی ڕۆشنبیری و بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوارم گوت سەری لێبدەن و قوتاریان بکەن و بۆ مۆزەخانەی هەولێری ببەن کە ڕەنگە هەر بە خۆڕایی عوسمان میران پێیانی دەبەخشی کە پتر لە دە دەرگای نەخشدار و دوو ئەستوونی یەکجار جوان بوون، بەداخەوە لەوانەیە بە دەیان جار بەسەیران چووبنە شەقلاوە، بەڵام کەسیان

سەریان لەوێ نەداوە، تا چوومە ئەوێ و پرسیم ئایا کەس هاتووە پرسیاری ئەمانە بکات؟ وتیان نەخێر.. وتم ئەو دەرابە و دەرگا و ئەستوونانەی وەستا مستۆ چییان لێ هاتووە؟ وتیان هیچیان نەماون جگە لەیەک دەرگا ئەویشمان بردۆتە هەولێر، هەر وەختێ هاتی فەرموون بڕۆن بۆ خۆتان بیبەن، بەم جۆرە ئەم سامانە عەنتیکە هونەرییە بەهۆی کەمتەرخەمی دائیرەی شوێنەواری هەولێر و دەزگای گشتی شوێنەوارەکان لەنێوچوو.

لە بیستەکاندا پیاو و ژنێکی ئینگلیز دەچنە گوندی سیساوە کە لە باکووری شەقلاوەیە، لە ماڵی عەبدولڕەحمان ئاغا دەرگایەکی نەخشداری وەک ئەمانە لە دەستکردی وەستا محەمەد ئەمینی وەستا مستۆ دەبینن، زۆر پێیان جوان دەبێ و داوا لە عەبدولڕەحمان ئاغا دەکەن و ئەویش دەیانداتێ و دەیخەنە ناو فڕۆکەکەیان و دەرگاکە دەبەنەوە لەندەن، ئەمانە پێش حەفتا ساڵ نرخی ئەو دەرگایانەیان زانیوە کە ئێستاش ئەو هوشیارییە لە دائیرەی شوێنەواردا نییە، هەندێ کەس لەکاتی دەسەڵاتداریێتی بەعسدا لە دائیرەکانی شوێنەواری هەولێر و سلێمانی بوونەتە بەڕێوەبەر، پاشان بوونەتە دەردو بەلا بۆ کەلەپووری کوردستان، کە بەشێکیان مرۆڤی نادڵسۆز و دزی شوێنەوار بوون و زیانی زۆریان لە شوێنەوار داوە، هەندێکیشیان دز نەبوون، بەڵام کەمتەرخەم بوون، دیارە مرۆڤ ئەگەر دڵسۆزی کورد و مێژووی میللەتی خۆی بێ کەمتەرخەمیش نابێ، بۆچی لەبەر دەرگای ماڵی بەڕێوەبەرەکە ئەم هەموو کەلەپوورە بەنرخە لەناوبچن، پێم وایە بەرپرسیارێتی مێژوویی لەسەر ملیانە و ئەم تاوانانەش بزر نابن.

بیری هونەری خانووسازی و نەخشی کوردی لەناو کورددا نەبووەو پێشینان بایەخیان پێ نەدابوو، ئەندازیارانی کورد ئەو فکرەیان هەر لەلا نەبووە. لەم وڵاتەدا کە بۆ یەکەمجار خانووبەرەی تێدا بەرهەم هاتووە لە (زەڤیا چەمی) لە گوندی شانەدەر لەسەر قەراغی زێ، من یەکەم کەس بووم بیرم لەم دوو بابەتە کردۆتەوە و لە کتێبی (بانگەوازێک بۆ ڕووناکبیرانی کورد لە پێناوی کۆکردنەوە و زیندووکردنەوەی کەلەپووری کوردیدا) باسم لێیانەوە کردووە کە لە ساڵی (١٩٨٥) چاپ بووە.

ئێستا شارەوانی سلێمانی نیازێتی بینایەکی شەش قاتی لە شوێنێکی گرنگی ناو شار دروست بکات، من ئەندامی لیژنەی دروست کردنی ئەو

بینایەم، سێ قاتی خوارەوەی من سەرپەرشتی دەکەم، لەوێدا نموونەی زۆر گرنگ لە بیناسازی کوردی لە کوردستانی باکوور و باشوور و ڕۆژهەلات زیندوو دەکەمەوە، یەک لەوانە ئەستوونە دارەکانی وەستا مستۆیە، کە لەخانووی میرانی قادر بەگ لە شەقلاوە لەناوچوون، ئەستوونی وام لە هیچ شوێنێ و لە هیچ فیلمێکدا نەدیوە، ئەو ئەستوونانە زیندوو دەکەمەوە و دەبێتە بینایەکی زۆر گرنگ، هەروەها سەعاتی (ئیبن ڕەزازی جزیری)شی تێدا زیندوو دەکەمەوە کە وێنەکەی لەکتێبی «الجامع بین العلم والعمل في صناعة الحیل» هەیە، ئەو سەعاتە بە ئەسڵ هی زانای فیزیایی و فەلەکی و وێنەکێشی کورد (یووسفی ئەستوڕلابی) بووە، ئەمیش هاوچەرخ، یان کەمێک پێش ئیبن ڕەزاز بوو، لەنێوان سەدەی (١١-١٢)ی زایینی ئەو سەعاتەی لە کوردستان دروست کردووە، ئیتر چ دیاربەکر یان حەسەن کیف، سەعاتەکە دەوری (٣) مەتر و (٣٠) سم بڵند و وەک هۆدە بووە و لەسەر سەرەکەی بورجی فەلەکی دروست کراون، هەر بورجێ لە چ ڕۆژێک بووە وردە وردە لە سەعاتەکەدا دیار بووە، ئەو سەعاتەش بە شەمێ ئیشی کردووە، مۆمی تواوە و چەندین جۆرە ئامێری میکانیکی ئاڵۆزی تێدا بەکارهاتووە، ڕۆژیش هەر سەعاتێکی تەواو بووە زەلامێکی ئالی لە یەکێ لەو دوازدە پەنجەرە دارە.دەرکەوتووە و خۆی پیشان داوە و دوو دەرگاکەش گیراون.

مانگ لە شەوێدا هیلال بێ، یان تەربیع، یان بەدر، یان میحاق لە هەمووادا بە قەد میقداری خۆی لەو شەوەدا بەدەرکەوتووە، بۆ سەعاتەکانی شەویش بازنەکانی خڕ بوون و جام لەبەریان بووەو وردە وردە سەعات لە دەقیقەیەکدا چەند دەرکەوتووە، لەپشتەوە فانۆس هەبووە هاتوچۆی کردووە، ڕووناکی بەقەدەر ئەو شەوە، سەعاتە، دەقیقەیە زیادی کردووە، ئەو جامە تەواو دەبوو ڕووناکیی هەمووی دەگرت، واتە سەعات تەواو دەبوو بەرەو خاڵی دیکە دەچوو کە شەش سەعات تەواو دەبوو دوو باڵندەی بازی هەبووە، گوللەیەکی خڕی وەک گوللە تفەنگی کوردی لە دەنووکیانەوە دەکەوتە سەر جامی پێش دەمیان تەقەی لێوە هاتووە، (٥-٦) ئینسانی ئالی لە ناو سەعاتەکە دروست کراوە، ئیتر کە شەش سەعات تەواو دەبوو هەموویان دەکەوتنە ئیش، ئەوی بووق بوو، لە بووق و دەهۆڵ و (صنج)ی دەدان و دەنگێکی گەورەی مۆسیقایی لێ بەرز دەبووەوە، خەڵک دەیانزانی چ لە ڕۆژ چ

له شەو شەش سەعات ڕۆیشتووە، ئەمە کارێکی فەلەکی و میکانیکی ئاڵۆزە تا ئێستا ئەو توانایەمان نییە ئەوە بخەینە ئیش، بەڵام من ئەم سەعاتە کە لە سەدە ناوەنجییەکاندا نموونەیەکی شارستانییە لە کوردستاندا و تەنیا یەکێکی وەک ئەوە هەبووە دەوڵەتی دۆستەکی کورد لە کاتی (نصر الدولة)ی کوڕی مەڕوانی کوڕی کەک لەسەدەی یازدەدا لە سەربانی مزگەوتی گەورەی فارقین دروستی کردبوو، کە شوێنەوارەکانیشی تا ساڵی (١٩١٠) مابوو، ئەمەش بەشێوەی هۆدەیەک لەسەر بینای شارەوانی زیندوو دەکەمەوە و دەبێتە شتێکی ئەنتیکە، بەڵام تەنیا لە ڕووی تەلارسازی و شێوە و وێنەوە زیندووی دەکەمەوە، لە ڕووی فەلەکی و ئیش کردنەکانی ترەوە کەس نییە ئەمە زیندوو بکاتەوە، بەداخەوە ئەگەر زانای بەهرەمەند (عەبدولخالق مەعرووف) بمایە کە لە ئەندازەی میکانیکیدا مرۆڤێکی بەهرەمەند بوو ڕەنگە بیتوانیایە ئەمە بخاتەوە کار کە بە داخەوە بە دەستی دوژمنان لە هەولێر لە (١٠ی نیسانی ١٩٨٥) شەهید کرا.

بەم شێوەیە دەتوانین کولتووری تەلارسازی نەتەوایەتی کورد زیندوو بکەینەوەو لە بینایە نوێیەکاندا گرنگییان پێ بدەین، هەروەها نەقاشەکانی کوردستان وەک (عەلی نەقاشی کەرکووکی) و (گوڵ محەمەدی سنەیی) و (ئیسماعیل)و (عەلی ئەکبەری سنەیی) کە ئەمانە هەموو نەقشەکانیان لە کوردستاندا تا ئێستا ماون و نەقشەکانی وەستا عەبدوڵڵای شیرین دەست و نیعمەتوڵڵای سنەیی (نیعمەتیان) دەتوانین ئەمانەش زیندوو بکەینەوە، یان نەقاشەکانی (مدیات)ی ناوچەی ماردین و نەخشەکانی کاتی- کاشی- کە لە هەندێ شوێنی عیراقی کۆندا ماون، دەتوانین ئەوانە هەموویان زیندوو بکەینەوە، کارەکانی وەستا و بیناساز و نەقاشەکانی مدیات و ماردین وەک ئیبراهیم گدۆ و مەلکێی کوڕی جەرجیس گندۆرە و ئوستاد جبێ و شێخ زرۆکی دەتوانرێ لە بینا نوێیەکاندا زیندوو بکرێنەوە.

جان وەیسی سنەیی لە سەدەی نۆزدەیەمدا لە خانەقای تەوێڵە هەندێ کاری خوردەسازی بە شووشەی ڕەنگاوڕەنگ وەک (ئاوێنەبەند)ە گەورەکە لە خانەقادا کردووە و دارتاش و ئەستوونەداری (محەمەد عەلی)ش نەخشی زۆر جوانی هەبوو، لە خەڵوەتی شێخ عەبدولڕەحمانی کوڕی شێخ سیراجەددین کە هۆدەیەکی بچکۆلە بوو وێنەی زیاتر (٢٠٠) بلبلی تێدا هەبوو، لەگەڵ وێنەی

گوڵی جوان و ناسک، به داخەوە کە ویستی لەسەر حیسابی خۆی چاکی بکاتەوە هەندێ کەسی هیچ لەبارانەبووی کۆنە بەعسی لەم ساڵانەی دواییدا بۆ دزی کردن لە پارەی بەهەشتی شێخ عوسمانی بیارە ڕووخاندیان، لە (١٩٩٣) پێوەندیان بە وەکیلەکەی کرد کە ناوی حاجی جەلال بوو، ئێمە «کۆمەڵەی کەلەپوور» چووین بە ڤیدیۆش وێنەمان گرت، سەربانی هەندێ هۆدەی کەوتبوو تەوێڵە وێران کرابوو، بەڵام دەسکاری تەکیەکەی نەکردبوو، حکومەتی عێراقیش نەیڕووخاندبوو و ئەفسەرێکی موتەدەین چووبوو هەندێ درز و کەلێنی بە گەچ چاک کردبووەوە . نووسراوی ڕەسمیشمان برد وەکیلەکە بزانێ لە (١٩٨٢)دا خانەقا کراوەتە بینایەکی شوێنەوار، تا دەسکاری دیوارەکان و گومەزە کۆن و نەخشدارەکەی سەر گۆڕی شێخ سیراجەددین نەکات، تەنانەت (چلەخانە) کە جێگەی زیکر و عیبادەتی ئەو کەسانە بوو کە هەڵبژێرا بوون بینە خەلیفە ساغ بوو، پێمان وت (چلەخانە)ش نابێ گەچکاری بکرێتەوە و دەبێ هەروەک خۆی بمێنێ، پاش ئەوەی کە پێوەندی حاجی جەلال بە خانەقاکەوە نەما، جەماعەتێ لە بنەماڵەی شێخان چووبوونە لای پیرەمێردێک کە ناوی شێخ سەفا بوو هەڵیان خەڵەتاندبوو و ئەندازیارێکی نالەباری بێ تەجرەبەی دەرچووی نوێیان لەگەڵ خۆیان بردبوو فتوایان لێ وەرگرتبوو بەدرۆ وتبووی خانەقا بێ کەڵک بووە و دەڕووخێ، تا ئەویش ببێتە شەریک لە دزییەکەدا، ئێمە ئەندازیاری تەلارسازی و کەلەپوورناس کە لە کۆمەڵەی کەلەپوور ئەندام بوو، لەگەڵ خۆمان برد کە کاک فارووق خانەقینی بوو، وتی خانەقا هەمووی ساغە و پێویست بە ڕووخاندن ناکات، ئەو کەسانەی ویستیان خانەقا بڕووخێنن و ڕووخاندیشیان هۆی سەرەکی ئەم تاوانەیان بۆ دزی کردن بوو، عەتوفی بابە حاجی خەڵکی تەوێڵە و نەزیفی برای بوون کە ئێستاش نەزیف ئەندامی کۆمەڵەی کەلەپوورە و ئەمەش گوناهی گەورەی نەزیف بوو، چونکە من لەکاتی خۆیدا ئەو دۆکیومێنتەم دابووێ لەگەڵ ئەو وتارەی دەربارەی خانەقاکە لە هەشتاکاندا لە گۆڤاری (کاروان)ی ژمارە دوودا بڵاوم کردبووەوە و پێم وت هەر کاتێ مەترسی لەسەر ئەم تەکیەیە هەبوو بە من بڵێ، دوایی لەلای لیژنەی کەلەپوورەوە بەرامبەر خانەقا ئەومان کردە بەرپرس و وتمان هەر کاتێ شتێ هەبێ کۆمەڵەی کەلەپوور ئاگادار بکەرەوە و ئەویش بەڵێنی دا، کەچی خۆی لە کۆبوونەوەی ڕووخاندنەکەیدا لە (مزگەوتی قەزازەکان) ئامادە

ببوو و بە ئێمەشی نەوتبوو، چونکە براکەی دەکرایە سەرپەرشتیاری ڕووخاندن و سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی بینایەکی نوێ لە شوێنەکەیدا. ئەو خانەقا مەزنە کە جوانترین خانەقای کوردستانی گەورەبوو، وێرانیان کرد و لەناویان برد.

خانەقای شێخ ئەحمەدی (خزنا)م لە ناوچەی قامشلی دیوە و خانەقای شێخان (نوورشین) لە ویلایەتی بدلیس و خانەقای شێخانی شۆڕشگێڕانی هیزانم لە هیزانی کوردستانی باکوور دیوە و گەلێ خانەقای ترم بینیوە هیچیان وەک خانەقای تەوێڵە جوانتر نەکەوتنە بەرچاوم و جوان نەبوون. ئەمەشیان بۆ تەماع و دزی کردن لە پارەی شێخ عوسمان لەناو برد کە ڕژێمی سەدام ڕێزی لێگرت و لە کاتی وێرانکردنی تەوێڵەدا نەیڕووخاند. دوایی کاغەزم بۆ شێخ عوسمان نووسی کە لە ئەستەنبووڵ بوو، شێخ عوسمان زۆر تووڕە ببوو، وتبووی من نەموتووە بیڕووخێنن، بەڵکو وتوومە تەعمیری بکەن. پێویستە ئەم تاوانبارانە بدرێنە دادگا، تا کەسانی نا کورد و تەماعکاری دیکە نەچن بینا کەلەپوورییەکانی کوردستان لەناوبەرن.

زیندووکردنەوەی کاری بیناسازی کارێکی گەورە و حەساسە، دنیای پێشکەوتوو زۆر نرخی دەزانێ، بۆ نموونە وەک پێشتر باسم کرد لەکاتێ کە جەزائیر داگیرکراوی فەرەنسی بوو ڕۆژنامەنووسێکی فەرەنسی وتارێکی دەربارەی هونەری تەلارسازی جەزائیر نووسیبوو دەسەڵاتی فەرەنسی دایانە دادگا، گوایە بەوە هەستی نەتەوەیی زیندوو دەبێتەوە، ئەوە هێندە کاریگەرە، ئێستا نەک هەر پێویستە ئەم بینا کۆنانە بپارێزین، بەڵکو دەبێ گەڕەکە کۆنەکانی شارەکانیش بپارێزین، ئەو گەڕەکانەی کە ئەسڵی مێژوویی شارەکانن، شارەکان زۆر گەورە دەبن، با بەشی کۆن و ئەوەی ماوە لەو گەڕەکانە و بەشەکانیان بمێنێ، چونکە تەرزی میعمارییان جودایە و لە پاشەڕۆژدا دەبنە شوێنی گەشتوگوزاری لەناو شارەکاندا و بۆ لێکۆڵینەوەی بیناسازی کوردی کەڵک لەو خانووانە وەردەگیرێ، ماوەیەکی زۆر بوو ئەم بیرەم هەبوو و توانیم بیکەمە بڕیارێکی ڕەسمی لە ڕێی ئەنجوومەنی وەزیرانەوە بە بڕیاری (١٢٧) کە لە ڕۆژی (١٩٩٨/٩/٩)دا بڕیاری لەسەر پاراستنی گەڕەکە کۆن و بینا کەلەپووریەکانی دا، هەمان ئەو پێشنیارەم نووسی بۆ وەزیری ڕۆشنبیری و شارەوانی هەولێر تا ئەوانیش ئەو گەڕەکە کۆنانەی ماون وەک گەڕەکی تەعجیل و بەشێک لە شێخەڵڵا و ئەوانەی دهۆک و زاخۆ و ئامێدی و ئاکرێ

بپـارێزرێن و وەک لە (١/ ١٠/ ١٩٩٩)دا لە ڕۆژنامـەی (دەنگی مـیللەت)دا نووسیم. ئومێدەوارم ئەم پرۆژەیە بە کردەوە بهێنرێتە پێش و سیمای شارستانی کۆن بپارێزین، نزیکەی (٢٥) ساڵە هەوڵ دەدەم ئەم کـەلەپوورە بپـارێزم و لەم پێناوەشدا تووشی زۆر ڕەنج و زەحمەت بووم، من بە ئیلحاحەوە ئیش دەکەم تا ئەو بینایانە ئیستـملاک بکرێن و بپـارێزرێن، وڵاتانی پێـشکەوتوو ئەمـانە دەپارێزن کە لە شارەکانیان ماوە پاش ئەوەی هوشیاری ڕۆشنبیری پەیدابووە.

* لە سۆماڵ لەکاتی سەرۆک (محەمەد سیاد بەڕی) بڕیاردرا گەڕەکێکی کۆن بڕووخێنن و کۆشکی کۆماری لەسەر دامەزرێنن، خەڵکی گەڕەک ڕازی نەبوون و وتیان گەڕەکەکە شوێنەوارییە و ڕازی نابین بڕووخێنرێ، ئیتر شکایەتیان بردە دادگا لە ڕێی پارێزەرەوە، دادگا حەقیان دایە خەڵکی گەڕەکەکە و نەیانهێشت حکومەت خانووەکانی بڕووخێنێ.

- بەڵێ.. کەچی هەندێ لە چەپەکانی لای خۆمان دەیانوت شوێنەوار چییە ئەمە کـۆنەخـوازییە، بێگومـان ئەمە وەک چۆن بە شێـوەیەکی نادروست لە شـیوعـیەت گـەیشتـبوون لەمـەشدا هەر بە هەڵەدا چووبوون. چینی مـیللی گەڕەکـێکی لە شـارێکی خـۆیدا لەسەر تەرزی عـەرەبی - ئیسـلامی ئاوەدان کـردۆتەوە، چونکە لە سەدە ناوەنجـییـەکـاندا جـالیـەیەک لە بازرگـانە عـەرەبە ئیسـلامـەکـان لەو شـارەدا ژیاون، ئیـتـر بۆ زیندووکـردنەوەی یادی ئەوکـاتە گـەڕەکـێکی خـۆیان لەسـەر ئەو تەرزە ئاوەدان کـرایەوە.. لای خـۆمـان دەیانوت ئەمە کۆنەپەرستییە، وەک گرووپی (ڕوانگە) کە دەیانوت مێژوو و شوێنەوار چییـە ئەمـانە کـۆنەپەرستین. زۆر دژایەتی ئەدەب و کـەلەپووری شـارسـتـانی کوردییان کرد، زۆر نموونەم لە کتێبەکەمدا هێناوەتەوە، نموونەیەکم هێنابوویەوە کـە کـێلێکی نووسـراوی خـەزنەدارێکی بابان لە کـۆیە، کـابرایەک بەناوی مـوعـتـەسەم مـەلا مـەجید موفتی بردبووی و بۆ سووکـایەتی کـردن بە مـێـژوو خستـبوویە سەر دەمی ئاودەسـتـخانەی خۆی، لە چ وڵاتێک ئەمە ڕوویداوە؟! دوایی پاش ساڵێک لە ڕاپەڕین من چووم بۆ لای مەلا مەجید بە تەنیا لەماڵ بوو بیرەوەری ئەوم تۆمار کرد، کەس لەماڵ نەبوو جگە لە خۆی ئاودەستەکەشم پشکنی وتم بەڵکە بەردەکە بدۆزمەوە، بینیم چیمەنتۆ کرابوو کە ڕەنگە بەردەکە لەژێر چیـمەنتـۆکەدا مابێـتەوە، چونکە لە شەستەکـاندا ئەو کارەیان کردبوو. ڕۆشنبیرانی کورد ڕۆڵێکیـان لەم بوارەدا نەبووە لەبەر ئەوە بەرانبەر کەلەپووری

شارستانێتی کورد گوناهبارن.
دەزگای گشتی شوێنەواران تەنیا یەک بینایەی کەلەپووری لە سلێمانی کڕی، ئەگەر بارودۆخی جەنگ نەبوایە چەندین خانووی کەلەپووری دەکڕی و کڕین و (ئیستیملاک کردن)یش بەهاندانی من بوو، ئەوەشیان خانووی حاجی ڕەشیدی وەسمان چاویش بوو، نەخۆشخانەی سەربازیی ئینگلیزەکانی تێدا بوو کە لەکاتی شێخ مەحموود هاتبوونە سلێمانی، ئەمەش نەخش و نیگاری زۆری تێدا بوو، پەنجەرەکانی بە شووشەی ڕەنگاوڕەنگ و شریتەداری ناسک و عروسییە گەورە ڕەنگاوڕەنگەکەشی بە پانی (٣) مەتر تێدا بوو، هەمووی لەلای دارتاشی هونەرمەند وەستا قاسمی سنەیی دروست کرابوون، لەگەڵ چەندین نەخشی سورەیا و لالە کە بە ئاوێنە لەنێوان تاقەکاندا دروست کرابوون، دەزگای شوێنەواران زیاتر لەبەر ئەو خەسڵەتە مێژووییەی کە نەخۆشخانەی سەربازی ئینگلیزی بوو کڕی.
وەک لە ڕاپۆرتەکەمدا بۆیانم نووسیبوو، لە چەندین شوێندا ناوی بەشەکان بە زمانی ئینگلیزی نووسرابوون، ئەم بینایە کە ئیستملاک کرا درایە دەست دائیرەی شوێنەواری سلێمانی و بووە موڵکی ئەم دائیرەیە، بەڕێوەبەرەکەی (ڕەفیق فەتحوڵلا) لە بواری شوێنەوارەکاندا زۆر کەمتەرخەم بوو، بەڵام نەمزانیوە دز بووبێ وەک هەندێ لە بەڕێوەبەرانی شوێنەوار، ڕەفیق ئەو بینایەی تەسلیمی پاسەوانێ کرد بەناوی (عەبدوڵلا فەرەج) کە حەرەسی شوێنەوار بوو تا بیپارێزێ، ئەمەش چەند جارێک برا بۆ ئەمن بە تۆمەتی ئەوەی پشتگیری پێشمەرگەیە، وەختێک لەپاش ئەنفال لە قەرەداغەوە هاتە ناو شار و چووە ناو خانووەکە، لە بەهاری (١٩٨٨) (موعتەسەم ڕەشید)ی بەڕێوەبەری شوێنەوارەکان هەڕەشەی لێکرد کە ئەگەر لە خانووەکە دەرنەچێ شکاتی لێ دەکات، ئیتر دەبوو چۆڵی بکات، پاشان موعتەسەم خانووەکەی هەڵوەشاندەوە و خانوویەکیشی لە حەوشی بیناکەدا ڕووخاند. کە هەر یەکەیان بە موشتەمەلاتەوە چوار هۆدە بوون، بەبێ ئیزنی دەزگای گشتی شوێنەواران، خانوویەکی بۆ خۆی لەسەر بناغە ڕووخێنراوەکە بە کۆنکرێت دروست کرد، دەرگاکانی بینا گەورە کەلەپوورییەکەی دەرهێناو کردییە دەرگای ژوورەکانی خۆی و ئەو خانووە کەلەپوورییەی بەبێ دەرگا هێشتەوە، ئێستا دەسەڵاتی سلێمانی لیژنەیەکی لێکۆڵینەوەی بۆ موعتەسەم داناوە و پاش ئەوەی

بەهاندانی وەزیری پێشوو (جەمال عەبدول) پارچە زەوییەکیشی وەرگرت لەگەڵ (١٠٧,٣٠٠) دینار تا خانوویەکی تر دروست بکات و ئەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری سلێمانی بەجێ بهێڵێ، کە دیتی هۆدەکانی تەقیون و ئیتر بە کەڵک نایەن و ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)ش بەلاپەڕەیەک دژی موعتەسەمی نووسی و ڕەخنەی لە (جەمال عەبدول) گرت کە خەتای ئەو بووە و زەوی و پارەشی داوەتە کابرا، جەمال بەرگری لەخۆی کرد لە هەمان ڕۆژنامەشدا ئیعترافی کرد کە زەوی و پارەی دراوەتێ و هەر شتێ کە ڕۆژنامەکە نووسیویەتی لە بارەی وێران کردنی خانووەکە لە لایەن موعتەسەمەوە ڕاستە و خانووەکە خۆی موتەجاوزە، یانی بە پێچەوانەی یاسا بینای کردووە و خانووەکەی وێران کردووە و قەرەبوو لەسەر تەجاوز نییە، وەختێکیش (عادل مەجید) کە ئەویش ماوەیەک بەڕێوەبەر بوو مالی بردە ناوی و مریشکی تێدا بەخێو دەکرد. فەرموون بەعس بێت خانووێکی کەلەپووری بکڕێ، بەلام بەڕێوەبەرێکی کورد بەڕێوەبەری دائیرەی شوێنەواری سلێمانی وێرانی بکات. جا کوانێ دڵسۆزی؟

بێگومان هەندێ لە بەڕێوەبەرانی شوێنەوارەکانی کوردستان کەمتەرخەم و نادڵسۆز بوون کە چەندین شوێنەواری کوردستانیان بە وێران کردنی یەکجارەکی داوە، ئەمانەشم ڕۆژانە لە یاداشتەکانمدا تۆمار کردووە، ئومێدەوارم لەمەولا پارتی و یەکێتی بیرێ لە شوێنەواری کوردستان بکەنەوە و کەسانی نالایق و دز لە دائیرەکانی شوێنەوار دووربخەنەوە و فەرمانبەرە دڵسۆزەکان بهێننە پێش و وەزعی شوێنەوار و کەلەپووری کوردی چاک بکەن.

(موعتەسەم ڕەشید) مۆزەخانەی شۆڕشی ئەیلوولیشی لە گەڵاڵە تالان کرد و ئەوکاتە خوالێخۆشبوو (دارا تۆفیق)ی توورە کرد و هەروەک بیستوومە (د. کەمال مەزهەر)یش لەسەر ئەم کارەی بێزاری خۆی دەربڕیوە، هەروەها تۆمەتی هەڵکۆڵینەوەی شوێنەوارەکانی پێنجوێنیشی بەشێوەی ناشەرعی درابووە پاڵ.

* پێت وایە هۆیەکانی ڕاگەیاندن، بەتایبەت ڕادیۆ و تەلەفزیۆن لەبارەی خزمەتکردنی کەلەپووری نەتەوایەتیمانەوە لە ئاستی بەرپرسیارێتی خۆیاندا بووبن؟

– ئەم ڕادیۆ و تەلەفزیۆنانەی کە لەپاش ڕاپەڕین لە کوردستاندا پەیدا بوون دەیانتوانی دەوری زۆر لە هوشیارکردنەوەی خەڵک لە بواری شوێنەوار و مێژوو

و کەلەپووردا ببینن، بەڵام بەڕاستی شتێکی وایان نەکرد و تا ئەمڕۆش ڕۆڵی خۆیان نەبینیوە، بۆیە بەرپرسیارێتی مێژوویيان دەکەوێتە سەر، لەبەر ئەوەی هەندێ لەوانەی ئەم شوێنانەیان بەڕێوە دەبرد، یان دەورێکی بەرزیان هەبوو، بەڵام دڵسۆز نەبوون، هەندێکیشیان نۆکەر و جاسووسی کۆنی حکومەت بوون و کەسانی باشیان دوور دەخستەوە، ئەمانە بڕوایان بە کورد و کولتووری کورد نەبوو، لەبەر ئەوە دەوری خۆیان نەدی، هەندێکیشیان کەسانی پاکی سەر بە شۆڕش بوون، بەڵام دەربارەی شوێنەوار و کەلەپووری شارستانیێتی ئەو هوشیارییەیان نەبوو و ڕۆشنبیرییان نزم بوو، ئەرکی خۆیان جێبەجێ نەکرد، هەندێ بەرنامەی بێکەڵک و شێواندن و چەواشەکردنی مێژووی کوردییان بڵاودەکردەوە، لە کاتێکدا پێویستیمان بە کەلەپووری شارستانی کورد هەیە.

ئێمە کە گلەیی لە ڕابردوو دەکەین و دەڵێین مێژوومان فەوتاوەو نەنووسراوە، ئەمە هەلێکە بۆ ئەوەی بایەخ بەو بوارانە بدرێ، فیلمی توند و تیژی دێن بڵاوی دەکەنەوە، ئەمانە کەسانی خۆپەرستن و حەز ناکەن کەسانی زیرەک لەو بوارانە نزیک ببنەوە، ئەگەر دڵسۆز بوونایە داوایان لە کەسانی پاک و پسپۆڕ دەکرد و یارمەتییان دەدان شتی بەکەڵک بڵاوبکەنەوە.

* جوانترین نەخش و نیگاری کۆن، خەنجەرێ، سیمفۆنیایەک، لاوکێ، خەونێک لەلای تۆدا چین؟

– جوانترین نەخش و نیگار لای من پەیکەری پاشای دەوڵەتی لۆلۆی کوردستانی کۆن (ئانوبانی نی)یە کە لەسەر شاخی زەهاو هەڵکەندراوە لە هەزاری سێیەمی پێش زایین کە نووسینی مسماری لەگەڵدایە، (ئانوبانی نی) گەورەی لۆلۆ بووە و پاشای ئەو بەشەی کوردستان بوو کە دەوڵەتی لۆلۆ لەناوچەی کرمانشا هەندێ جار ورمێ تا زێی گەورە و هەولێری کەوتۆتە ژێر دەست، هەندێکیان لە وڵاتی ئاشووریش حوکمیان کردبوو، چونکە ناوی دوو سێ پاشا لە پاشایانی دەوڵەتی ئاشوور لۆلۆییە، شوێنەوارناسان وا تێدەگەن لۆلۆ بن، لەنامەخانەی پاشای ئاشووری، ئاشوور بانیپاڵ لەوحێکی مسماری نووسراوە لە بارەی لۆلۆکانەوە بەڕێز دکتۆر فەوزی ڕەشید لە کتێبەکەیدا «نارامسین ملك الجهات الأربعة» بڵاوی کردۆتەوە، لەو لەوحە مسمارییەدا هاتووە «لۆلۆیەکان کە باوکیان ئانوبانینیە (٣٦) هەزار جەنگاوەریان هێرشیان بردە سەر باشووری ئەنادۆڵ و داگیریان کرد، گەڕانەوە هێرشیان بردە سەر

کەنداو و بەحرێن و عومانیان داگیر کرد، ئەوانە زۆر بەهێز بوون نارامسینی ئەکەدی وای دەزانی لۆلۆبییەکان لە ڕەگەزی مرۆڤ نین و لە شیری (تیامە)یان خواردۆتەوە، بەڵکو لە جن و شەیتانن دایکیان تیامەیە کە خوداوەندی شەڕە و ژنی ئانوبانینیە، وا بەناوبانگ بوون کە چەکی شەڕ کاریان تێناکات، ئینجا نارامسین داوای لە فەرماندەی سەربازی خۆی کرد کە ناوی (لدوو) بوو وتی هەندێکیان بگرە و نێزەیان لێبدە، ئەگەر خوێنیان لێهات واتە ئەوانە مرۆڤن، دوایی کە هەندێکیان گرت و نێزەیان لێدان و خوێنیان لێهات زانییان مرۆڤن، هەر بۆیە نارامسین داوای لە (عشتار) کرد ڕێی بدات تا بچێتە شەڕی لۆلۆبی، بەڵام نارامسین سێ ساڵ لەسەر یەک هێرشی کردنە سەر، جارێک بە (١٢٠) هەزار سەربازەوە، جاری دووەم بە (٩٠) هەزار سەربازەوە، جاری سێیەم بە (٦٧٠٠) سەربازەوە هەموویان کوژران، ئینجا لە عشتار پاڕایەوە کە ئیزنی بدا بچێتە شەڕیان و سەرکەوێ، لەبەر ئەوەی بێ ڕەزامەندی عشتار چوو بوو واشی تەفسیر کردبوو کە بەبێ ڕەزامەندی ئەم خواوەندە چووە، بۆیە لەشکرەکەی هەمووی قڕ بووە، ئیتر ڕێگەی دەدات و دەچێ ئەمجارە لە شەڕەکەدا سەردەکەوێت و دوازدە کەس لە شەڕەکە بەدیل دەگرێت و داوا لە عشتار دەکات ڕێگەی بدات بیانکوژێ، عشتار دەڵێ مەیانکوژە ئێمە لە کۆمەڵگای خواوەندان خۆمان سزای ئەو میللەتە دەدەین و برا دەکەینە دوژمن لە برای خۆی و شار دوژمنی شار و گوند دوژمنی گوند و شارستانیەتیان لەناو دەبەین». لە (ڕێگای کوردستان) لە (١٩٩٥/١٢/٥) ئەمەم بڵاوکردەوە لە ژێر ناونیشانی «یەکبوون و بەهێزی، دووبەرەکی و لاوازی کورد لە نووسینێکی بسماریدا - ئاراستەیە بۆ سەرکردەکانی شەڕی براکوژی» تا عیبرەتی لێ وەربگرن کە وەختێ لۆلۆبییەکان یەک بوون توانییان (بە گوێرەی ئەو نووسینە ئەگەر ئەفسانەش بێ وا نووسراوە) کەنداو و بەحرێن و عومان داگیر بکەن، بەڵام کاتێ دووبەرەکی کەوتە ناو ئەو میللەتەوە چۆن بوونە میللەتێکی بێهێز و دوژمنان وڵاتیان لێ داگیرکردن، کوردیش وایە ئەگەر یەک دەست بێ دوژمن پێیان ناوێرێ، هۆکاری سەرنەکەوتنی کورد دووبەرەکییە، وەک قازی «شهاب الدين ابن فضل الله العمري» مێژوونووسی میسری لەنێوان سەدەی (١٣-١٤) نووسیویەتی «الاكراد أمم لا تحصى و خلائق لا تعد فلولا أن سيف الفتنة بينهم مسلول ينبه نائمهم و يحصد قائمهم لفاضوا على البلاد و

فازوا بالطريق والتالد» جگەرخوێنی مەزنیش دەڵێ:

**«ئەمیر و بەگلەر و ئاغا و پسمام**
**کرن وێران سەرا و بورج و خانی**
**وەکو شێر و پلنگان ئەم دەچوون هەڤ**
**رووڤی پەنیر ژمەی دانێ هیلانی**
**ئەرێ بووکێ پەپووکێ ژار و مەستێ**
**لەسەر سنگێ تەزا ڤاما بیانی**

بووک یانی کوردستان، ئومێدەوارم ئەم حزبانە ببنە یەک و دەوری خۆیان لە رزگارکردنی کوردستاندا ببینن.

* پێویستە ژیاننامەی ئەدەبی و خوێندن و بەرهەمەکانت بزانین؟

- لەم چاوپێکەوتنەدا زۆر لە هەوڵ و تێکۆشانەکانم لە بواری کولتوور و شوێنەوار و ئەدەبیات باس کرد، لیستەیەک لەو نووسینانەم کە هەندێکیان پاکنووس کراون و هەندێکیان ماویانە، لەوەش دانەیەکتان لەلایە.. کتێبەکەم (دیوانی کرمانجی) لە مێژووی ئەدەبی کرمانجی دەکۆڵێتەوە، کە لەلایەن رۆشنبیران ئەوپەڕی بایەخدارە، بە دەیان لێکۆڵینەوە و وتارم لە بواری ئەدەبی کوردیدا بڵاوکردووەتەوە و زۆریش ماون و بڵاو نەبوونەتەوە، کتێبی (یووسف و زولەیخا)ی سەلیمی هیزانیم ئامادە کرد بۆ چاپ کە لەسەر سێ دانە دەستنووسی کوردستانی باکوور لێکۆڵینەوەم لەبارەوەیەوە کردبوو و لە ساڵی (١٩٨٤)دا دامە ئەمینداریتی گشتی رۆشنبیری لە هەولێر و بڕیاری چاپ کردنی درا، بەڵام حەوت ساڵ لەوێ مایەوە و بە ئەنقەست چاپیان نەکرد و فەوتاندیان، یانی بەقەدەر حەوت ساڵەی بەندکردنی یووسف لە میسر لە لایان مایەوە!

* چی لاوازییەک لە لێتوێژینەوەی ئەکادیمیدا هەیە و لێکدانەوەی بەرنامەی مێژوویی چییە و ڕێگاکانی پەیداکردنی زانست چین و ئەزموونەکانی خۆت لەم بوارانەدا چین؟

- یەکەمین کەس کە ڕەخنەی مێژوویی نووسیبێ «هیکتابووسی مەلەتی یۆنانی» بوو لە سەدەی (٦)ی پێش زایین کە ڕەخنەی لە سەرگوروشتەکانی پێش خۆی گرتووە، هەندێ لە زانایانی بەرنامەی توێژینەوەی زانستی یەکەمین

جار كه ڕواياتی مێژوویی ڕێكخستووه دەڵێن زانایانی ئیسلام له (مصطلح الحديث)دا سەنەدی ڕوایەتەكان كه پشتاوپشت لەیەكیان بیستووه، ئینجا بەپێی وەسفەكان و ڕەوشت و تەبعی ڕاوییەكان ئەگەر خراپ بن زانایانی حەدیث وتوویانه خراپه و پشت به ڕیوایەتی ئەو كەسه نەبەستراوه، لەبەر ئەوه حەدیث كه دەدرێنه پاڵ پێغەمبەر دوای قورئان یەكەم سەرچاوەی ئایینی ئیسلامه، زۆر زانا تەحقیقیان لەم حەدیثانه كردووه، جاری وا هەبووه زانایەک له خوراسان سەفەری بۆ میسر، یان هندستان كردووه تا سۆراخی ڕاستێتی حەدیثێ بزانێ، بەڵام ئەوەی كه سەنەدی ڕیوایاتی حەدیثی وەک بەرنامه داناوه، زانای كورد ئیبن سەلاحی شارەزووری بووه كه له سەدەی سێزدەی زایینیدا كتێبی بەناوی «مصطلح الحديث» دانا، هەندێک زانا شەرح و تەعلیقیان لەسەر ئەمەی ئیبن سەلاح نووسیوه، یەک لەوانه حافزی مەشهووری حەدیث زەینودینی عیراقی عەبدولڕەحیم كه خەڵكی كوردستانی باشوور بووه، ئەوه شەرحی بۆ داناوه كه مامۆستای ئیبن حەجەری عەسقەلانی بووه، ئیبن حەجەر «نوخبة الفكر»ی نووسیوه هەر له زانستی (مصطلح الحديث) خۆیشی شەرحی (نوخبة الفكر)ی كردووه، وەختی خۆی من دەرخم كردووه، ئیبن خەلدوون دانەری زانستی ئیجتماعه و كەڵكم له هەموویان وەرگرتووه و زۆر هێز به مێژوونووس و لێكۆڵەرەوەكان دەبەخشن.

* له بەرنامەی لێتوێژینەوەی زانستیدا چۆن باسی پێشەكی نووسین كراوه؟

– مەرجێكی تری بەرنامەی لێتوێژینەوەی زانستی نووسینی پێشەكییه، (د. عەلی جەواد ئەلتاهر) دەڵێ ئەگەر بابەتێ (٣٠٠) لاپەڕە بێ گرنگه پێشەكی له (٥–٦) لاپەڕە كەمتر نەبێ، پێشەكیش عادەتەن دانەر تێیدا دەستنیشانی بابەتەكەی دەكات و پلانی لەم بابەتەدا چۆنه و هۆكارەكانی هەڵبژاردنی بابەتەكه و بۆچی دەستنیشانی كردووه دەكات، بەڕای من (٥–٦) لاپەڕە كەمه و بەش ناكات، زانایانی تری ئەو بوارەش هەر تەئكید لەسەر پێشەكی دەكەن، ئەو بەرنامه ئەكادیمییانه به زۆر مەرجەوه بەستراوەتەوه و بەپێی ئەزموونی نووسینی خۆم دەبێ سەربەستی زیاتر بدرێ به دانەر، سەرچاوەكانی توێژینەوەش نوقتەیەكه، له لێتوێژینەوەی ئەكادیمیدا كاتێ خاوەنی باسەكه، یان نامەی ماجستێر و دكتۆرا باسی ئەو سەرچاوانه دەكەن، له پاش (پێشەكی) پێویست بەوه ناكات لەوێ بایەخی ئەو سەرچاوانه بنووسێ، چونكه له

پەراوێزەکـاندا دەزانرێ، بێـجگە لە هەندێ سـەرچاوەی گـرنـگ بەتایبـەت دەسـتنووسـەکـان، زۆرجـار قـوتابی زانیـاریی کـەمـە و بۆ ئەوەی قـەبارەی لێکۆڵـینەوەکەی بگاتە (١٥٠) لاپەڕە و ڕەخنەی لێنەگیرێ، دێت ئەم شێـوازە بەکـاردێنێ و زیاد لە پێـویست دەربارەی هەڵسـەنگاندنی ئەو سـەرچاوانە دەنووسێ، بەڵام بۆ مێژوونووسی تر ئەمە پێویست ناکات سەرچاوەی دەگمەن نەبێ (دەبێ بزانین لێرەدا مەبەستم لیستی ناوی سەرچاوەکان نییە).

* ئەی پەراوێزەکان چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ؟

– کـۆکـردنەوەی پەراوێزەکـان و بڵاوکـردنەوەیان پێکەوە لە پاش هەر مـەوزووعێـک، یان بەشێـک لە بەشەکـانی کـتێب بە باش دەزانم، چونکە هەر پەراوێزێک لە شوێنی خۆی نامێنێ و دوور دەکەوێتەوە و دەبێتە بارگرانییەک بۆ خوێنەوار تا پەڕەکـانی کـتێب هەڵبداتەوە و هەمـوو جارێک بچێـتە سـەر پەراوێزەکان، تا هەر پەراوێزێک بدۆزێتەوە، هەروەها لە عەیبەکانی ئەم ڕێبازە ئەوەیە جار هەیە لە بیری خوێندەوار دەچێ تەماشای پەراوێز بکات و جاریش هەیە مـاندووە و هەر تەمـاشـاشـیـان ناکـات، ئەگـەر هەڵەش کـەوتە زنجیـرەی پەراوێزەکـانەوە کـە زۆر جـاریش ئەمـە ڕوودەدات، ئەوە زۆر بە زەحـمـەت خـوێندەوار پەراوێزەکـەی بۆ دەدۆزرێتـەوە و جـار هەیە سـەری لێ دەشـێـوێ و لەباتی ئەم پەراوێزە، پەراوێزی دیکە دەخـوێنێـتـەوە کـە ئەمـە هەمـوویم بەسـەر هاتووە، بەڵام ئەگـەر هەر پەراوێزێک لە شـوێنی خۆی و لـە دامەنی لاپەڕەکـەدا بنووسرێت زۆر باشـترە و ئەم هەمـوو گـیروگرفـتـانە دروست نابن. ڕەنگە ئەم ڕێبازە هەڵەیە لە ڕێگای ئەکادیمییەکانەوە پەیدابوبێت. کۆکردنەوەی وێنەکانی نێو کـتێبیش و بڵاوکردنەوەیان پێکەوە لە کۆتایی کـتێبدا، هەمـان خەوش و نوقسانییەکانی کۆکردنەوەی پەراوێزەکان و پێکەوە بڵاوکردنەوەیان هەیە.

نەنووسینی ناوی سەرچاوەکان بە تایبەتی گرنگەکان لەنێو ناوەرۆکی کتێبدا هەریەک لە شـوێنی خۆی و کـۆکـردنەوەیان لە پەراوێزدا بەشێـوەیەکی بەردەوام، ئەمـەش چەندین هەڵەی بەدوادا دێ، ئەگـەرچی ئەم ڕێبـازە ئەکـادیمییـە و وەک هێلکەیەکی پاککراوە، بەڵام ناوەکـەی بۆگـەنە و چەندین خـەوشی زانسـتـیی هەیە، لەوانە کـۆکـردنەوەی نـوسین و زانیـارییـەکـانی چەندین مـێـژوونووس و سەرچاوە پێکەوە لە ناوەرۆکی کـتێبەوە و ئامـاژەکـردن پێیـان لە پەراوێزدا بە یەک نمرە و هەموو وەک یەک بەبێ جیاوازی، لە کاتێکدا زۆربەی زانیارییەکان

هی یەکێکیانە، یان دووانیان، یان یەکیان یەکەمین جار ئەو زانیارییانەی خستووەتە سەر کاغەز و پێی زانیوەو بە ڕەنجێکی زۆرەوە بەدەستی کەوتووە، ئەوانەی دیکە لەویان وەرگرتووە، یان شتێکی کەمیان لەو مەسەلەیە نووسیوە، یان هەندێکیان بە لاوازی نووسیویانە، جاریش هەیە هەندێکیان لە تەفاسیلدا بە هەڵەداچوونە، بەڵام ئێستا لە پەراوێزدا هەموویان بە شێوەیەکی (سۆسیالیستانە) بوون بە هاوبەش.

ئەوەی یەکەمجار ئەو مەسەلەیەی نووسیوە و دەستپێشخەر بووە، یان داهێنەر بووە، یان زانیارییەکانی پتەوتر بووە، بەم شێوەیە ماف و دەوری بزر کرا، ئەمەش یەکێکی ترە لە عەیبەکانی ئەکادیمییەکان و ڕێبازیان، چونکە ئەم ڕێبازە ئاسانترە. لەبەر ئەو هۆیانە بە ڕای من دەبێ زۆر جار ناوی مێژوونووس و سەرچاوەی باش و گرنگتر لە ناوەرۆکی کتێبدا بنووسرێت، خوێندەواریش بە باشتر ناوی مێژوونووس و سەرچاوەکەی دەکەوێتە بەرچاو، بەتایبەتی ئەگەر ئەو مەوزووعە (جەدەلی) بێ و کێشمەکێشی ئیسپات کردنی لەسەر هەبێ و مەوزووعێکی زۆر ناسک و (حساس) بێ.

پێشتر کە وتم تەفسیری ئیبن خەلدوون بۆ مێژوو (دەوری)یە، لێرەدا ڕوونتری دەکەمەوە کە دەڵێ: «ئەو میللەتەی دواکەوتووە، دەست بە خەبات دەکات بۆ دروستکردنی دەوڵەت و شارستانیەت، ئەویش بۆ ماوەیەک دەمێنێ و دوای ئەوە پیر دەبێ و دێتە دەوری نەمان و میللەتێکی تر کە لەدەوری هێز و بەداوەتدایە، دێ دەوڵەتی میللەتی پێشوو لەناو دەبات، دەوڵەتێ لە بەداوەت دروست دەکات و ناگاتە شارستانیەت و دوای ئەوەش دیسان پیر دەبێ و میللەتێکی تر دێت دەوڵەت دروست دەکات. ئەمەش (تەفسیری دەوری) ئیبن خەلدوونە کە بیرمەندی ئیتالی (بیکۆ) لەسەدەی (١٧ تا ١٨) زیاتر ڕوونکردنەوەی دایە ئەم تەفسیرەی دەوری، هەروەها تەفسیری ماددی بۆ مێژووش ئەوەیە کە مارکس دایڕشتەوە؛ ئەمەش بەهۆی ماددیەتی دیالەکتیکەوە زانستێکی گشتییە بۆ کۆمەڵگە لەسەر بنەڕەتی کۆمەڵایەتی میللەتان دامەزراوە، مارکس دەڵێ ماددە ئەسڵە و ژیانی ڕۆحی و هوشیاری کۆمەڵایەتی لقە، مارکس وتوویەتی پەرەسەندنی شێوازەکانی بەرهەمی خێراتی ماددی پێویست بۆ ژیانی مرۆڤ، وزەی بنەڕەتی و داینەمۆی مێژووە و دەبێتە هۆی ئەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی بگواسترێتەوە بۆ سستمێ و لەو سستمە بۆ

سستمێکی تر، ئەمە پێی دەڵێن (تەفسیری ماددی) تەفسیری میثالی هەیە کە دەڵێ ژیانی ڕۆحی ئەسڵە و ماددەش بەرهەمی ئەوەیە، ئەمەش تەفسیری میسالییە.

مێژوو بریتییە لە هەواڵێکی بێ حەد و حسابی مێژوویی، واتە مێژوو خەبەرە نەک زانستێک قابیلی هەڵە نەبێ، هەواڵ بۆ خۆی «مایحتمل الصدق و الكذب» لەوانەیە ڕاست بێ یان ڕاست نەبێ، بەڵام هەواڵی ڕاست یەک لە هۆیەکانی زانستە، هۆیەکانی زانست کە مرۆڤ پێی فێری زانست دەبێ و زانیاری پێ پەیدا دەکات سێ شتن وەک فەیلەسووفانی یۆنان و ئیسلامیش وتوویانە:

(١) حەواسی سەلیمە، پێنج هەستەکەیە بیستن و بینین و بۆنکردن و چەشەکردن و هەست، کە ساغ و تەندروست و بێ کەموکوڕی بێ.

(٢) الخبر الصادق، هەواڵ و زانیاری و ئاخافتنی ڕاست، زانابوونی ڕاستەقینە.

(٣) (عقل).. خەبەری ڕاست دوو شێوەیە: موتەواتر (متواتر)، وەک بڵێی بەغدا هەیە ئەوەی نەشیدیبێ ئەمە دەزانێ، موتەواتر ئەو ئاخافتنەیە کە لەسەر زاری خەڵکی عەوام دەوترێ کە مومکین نییە لەسەر درۆ یەکتر بگرنەوە، ئەمە تەواتورە، گێڕانەوەی مێژوو ییش هەیە و قابیلی گومان نییە. ئەو زانیارییانەی بەدیهین و مەحسوساتە و گومانیان تێدا نییە، ئەوەی بە چاو دەبینرێت ئەمە زانیاری پێویستییە، وەک زانایانی ئیسلام دەڵێن حەتمییە کە تۆ تەماشای دیوارێ دەکەیت ئەمە جێگەی گومان نییە «علم بالضرورة»یە، عەقڵیش هێزێکە لە نەفسی مرۆڤدا ئامادەیە بۆ فێربوونی زانست و لێکۆڵینەوە کردن، غەریزە زانیاری ڕاستەقینە وەردەگرێت، وەک (یەک نیوەی دووانە) ئەمە «العلم بالضرورة»یە، لە دوای ئەمە پێی دەڵێن «أستدلالي» کە بە بەڵگە و بەهۆی لێکدانەوە و پەیداکردنی بەڵگە و بیرکردنەوەوە دەبێ، ئەمە زانستی «ئیکتسابی» پێ دەگوترێت کە مرۆڤ بە شێوەیەکی زانستانە دەری دەخات، پێویستی بە بیرکردنەوەیە، بەڵام زانستی زەرورەت بێ بەڵگە پەیدا دەبێ و وەک خەبەرێ دەچێتە گوێچکەت، ئەوە گومانی تێدا نییە، ئەگەر گوێچکەی بە پێچەوانە و بە هەڵە گوێی لێ نەبێ و شتێکی (حسی) بێ، ئەمە «علم بالضرورة»یە، سرووش لە هۆیەکانی زانست نییە، چونکە ئەمە تایبەتە،

زانست ئەوەیە مرۆڤ بە ڕێگای ئیستدلالەوە لە ڕێی گفتوگۆ و بەڵگەو لێکۆڵینەوەوە پەیدا دەکات، (سرووش) پێی ناڵێن زانست و ئەو (وحی)یەی بۆ پێغەمبەران هاتووە زانایانی ئیسلام وتوویانە (عیلم) نییە، چونکە بەدەست هێنان و پەیداکردن (اکتساب) نییە.

(باحثیەت) غەریزەیە لە نەفسی مرۆڤدا بۆ لێکۆڵینەوە و دۆزینەوەی بەڵگەکان لەسەر ڕاستی و ناڕاستی و دوولایی لە زانیاری، ئەوەی دەخوێنێ شوێنە لاوازەکانی نووسینی خۆی دەدۆزێتەوە، تا بتوانێ دەرەنجام (ئستنتاجات) لە (تەعمیمات) دەربهێنێ، بەڵام (ئیستقراء) لە (جوزئیات) پێکدێت کە کۆمەڵێ بەڵگەیە بۆ مەسەلەیەکی گشتی دروست دەکرێت، ئەمە ڕێگەی ئیستقرائییە، ئەم هەردوو ڕێگەیەش لە چەندین زانستدا هەیە.

هێزی باحثیەت لەوەدایە تاقەتی وردەکاری لە نووسیندا هەبێ، ئەم هێزەش دەگمەنە و لە کەم مرۆڤدا هەیە، ڕەنگە لە دوو سەد کەس یەک کەس ئەوەی تێدا بێ، هی وا هەیە زانستی زۆر لە چەندین بواردا دەزانێ، یان لە زۆر شوێن گەڕاوە و شارەزایە، یان نووسەرێکە بیرتیژە شتێکی پەنجا ساڵ لەمەوبەر بینیبێتی وردەکارییەکانی هەر لەبیر ماوە، بەڵام کە دێیتە سەر نووسینەکانی تەماشا دەکەیت وردەکاری لە نووسینیدا نییە، هەندێ جاریش نووسینی لاوازە، واتە هێزی باحثییەتی (الباحثیة)ی تێدا نییە.

(١) مرۆڤ بۆ ئەوەی ببێتە زانایەکی باش پێویستی بە زەین تیژی لەگەڵ زیرەکایەتییەکی زۆر هەیە، لێرەدا جیاوازی لەنێوان زەین و زیرەکی دەکرێ.

(٢) یادەوەرییەکی بەهێزی هەبێ و لەسەر خوێندنەوەی سەرچاوەکان و نووسین بەردەوامبێ.

(٣) مەرجێکی تر ئەوەیە هێزی باحثانەی هەبێ، هەر مرۆڤێ گەیشتە پلەیەکی بەرز لە زانست دەبێ ئەم مەرجانەی تێدا بێ، ئەگەر یەکیانی تێدا لاواز بێ ڕەنگە بەو پلەیە نەگات، واتە هێزی وردەکاریی شتێکی تایبەتە لە مرۆڤدا وەک زاکیرە تایبەتە، وتمان هەندێ کەس زاکیرەی تیژەو زانیاریی تێدا هەیە، بەڵام کە دێتە سەر نووسین ئەوە لە ئاستی زاکیرە و زەین و زانستەکانیدا نییە.

(٤) کەسێک بیەوێ ببێتە زانا دەبێ زۆر بخوێنێتەوە، زۆر زۆر ئاگای لە سەرچاوە نوێیەکان بێ و سوودیان لێ وەرگرێ، ئەوەی زۆر زانایە زۆر لەوانی

دی ماندووتره، مرۆڤ ئەگەر مەرجەکانی پێشتریش ئاماژەمان پێیان دا لە خۆیدا ببینێ ئەگەر نەیخوێندەوە ناگاتە ئەو پلەیە، چونکە مرۆڤ چەند زاناش بێ ئەگەر چەند ساڵێک لە خوێندنەوە دوورکەوتەوە زانیارییەکانی لاواز دەبێ، ئەگەر مرۆڤ کتێبێکی دانا و ئیتر بۆ ماوەی دە ساڵ دوورکەوتەوە زۆر لە زانیاری نێو کتێبەکەی خۆشی لەبیرنامێنێ.

(٥) مەرجێکی بنەڕەتی گەیشتنی مرۆڤ بە پلەیەکی بەرز لە زانابوون، ئەوەیە چێژ لە ماندووبوون وەربگرێت، نەک هەر وزەی بەدواداچوونی بابەتی سەختی هەبێ، بەڵکو چێژیشی لێ دەبینێ کە هەرگیز بەو شێوەیە لەزەت لە شتی ئاسان نابینێ، دەبێ تاقەتی هەبێ دەیان سەعات تەماشای یەک وشەی دەستنووسێ بکات کە بە (شێ) تێکچووبێ تا ماناکەی بۆی ئاشکرا بێ، واتە لێی ماندوو نابێ، بەڵکو زەوقیشی لێ دەبینێ، جاریش هەیە هەر هیچ بۆی ئاشکرا نابێ و وەختێکی زۆری لێ بە فیڕۆ دەچێ، بەڵام لێی پەشیمان نابێتەوە، چونکە ویژدانی زانستیی بەو ماندوو بوونە دەحەسێتەوە و دەزانێ لە هەوڵدان بۆ زانینی ئەو شتە سەختە کەمتەرخەم نەبووە، من تا ئێستا ئەوە چەند ڕۆژێکە دوودڵ بووم لەوەی باسی خۆم بکەم کە شتی وا کەوتۆتە بەرچاوم و لەززەتم لە سەختییەکەی وەرگرتووە، خۆم هەڵناکێشم، خوێندەوار دەبێ بزانێ لە نووسیندا تەجرەبەی نیزیکەی (٤٠) ساڵم هەیە. لە بەهاری ساڵی (١٩٦٠) دەستم دایە مێژوو نووسین، کاتێ لێکۆڵینەوەم لەبارەی وێنەکانی شەرەفنامە کرد، حیسابم کرد دەوری (٥٢) سەعات تەماشای عیبارەتێکم کردووە کە لەناو وێنەیەکدا نووسینێکی زۆر وردبوو، نووسینەکە خۆیشی بەشێکە لە وێنە، ئینجا بە هەڵە خوێندمەوە، لەم (٢-٣) ساڵەی دوایی کە لێکۆڵینەوەی قووڵتری ئەو بیست وێنەیەم کرد، واتە تابلۆکانی نێو نوسخەی یەکەمینی شەرەفنامە کە خۆشبەختانە کەوتۆتە نامەخانەی بۆدلیان لە زانکۆی ئۆکسفۆرد ماون و بەدەستخەتی شەرەفخان خۆیەتی.

قۆناغی دووەم گەیشتمە ئاکامی تەواو و بە ڕاستم خوێندەوە کە خوێندنەوەیەک بوو لە تابلۆی دووەم دەربارەی داگیرکردنی «قەڵای دزێ» لە هەکاریێ لەلایەن ئەسەدودینی میری هەکارییەوە، هەروەها زۆر تەماشای ئەو مۆر (توغرا) گچکەی شەرەفخانم کرد و توانیم بیخوێنمەوە کە لە تابلۆی هەژدەیەمدا هەیە و پێوانەی ئەو مۆرە ٢,٥ملم بە ١,٥ملم-ە ئەویش بە شێوەی

هەردوو خەتی تێکەڵاو لە شێوەکانی (جەلی) و (کوفی)، پاشان بۆ مامۆستای خەتی عەرەبی بەناوبانگ «یووسف زەنوون» لە مووسڵ گەورەم کرد تا بیخوێنێتەوە، بەڵام «یووسف زەنوون» بۆمی نووسی کە باش بۆی نەخوێندراوەتەوە، بەڵکو لە بارەی نووسینێکی کە لەویش وردتره نووسیویەتی ئەوە تەنیا ڕەشاتییەکە و نووسین نییە، بەڵام لە لاپەڕە «٦٠-٦٢» لە کتێبەکەم تابلۆکانی شەرەفنامە، ئەوی وردتربوو «١١,٥ملم»ە (١٠٠ ٪) بۆم ساغ نەبۆوە، (بەڵام پاشان بۆم ساخ بووەوە کە ئەوە مۆرێکی وردی شەرەفخانە کە وشەی «ولی»یە و لە شێوەی چرا و بڵێسەی چرادایە کە بە ڕای من مۆری نێو ئەنگوستی شەرەفخانە، «ولی»ش بە ئەسڵ ناوی خودایە)، چەندین جار لە نامەخانەی بۆدلیان داوام کردووە ئەم شتانەم بۆ بخوێننەوە، زیاتر لەجارێک مامۆستا (ئەنوەر سوڵتانی) چووەتە نامەخانەکە و نامەی بۆ من نووسیوە و لەنامەکەدا دەڵێ: لە نامەخانەکەدا کەس نییە ئەم نووسینە وردانە بخوێنێتەوە، لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵدانانەشم من لە خوێندنەوەیان ماندوو نەبووم کە دەیان کاتژمێر بە زەڕەبین تەماشای ئەو مۆرە گچکەیەم کردووە، ڕەنگە ئەگەر زۆر کەسی تر تابلۆکە ببینێ هەر هەستیشی پێ ناکات کە مۆر و ئیمزای شەرەفخانن، یان هەر هەست ناکات کە نووسینە، من نەک هەر ماندوو نەبووم، بەڵکو بە تەماشاکردنی چێژیشم لێوەردەگرت.

بۆ نموونە باسی تەجرەبەیەکی تر دەکەم کە لە ساڵی (١٩٨٢) مامۆستای بەهەشتی زانا و مێژوونووس «شێخ محەمەدی خاڵ» هەندێ بەڵگەنامەی دەستنووسی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم و پێشتریشی دایە من فۆتۆکۆپییان بکەم کە بەم شێوە خەتە شکستە سەختە فارسییەی ئەو وەختە نووسرابوون، نەمدەزانی بیان خوێنمەوە، ئیتر بردمنە لای کوردەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات، یەک لەوانە «شێخ هادی دەوڵەت ئاوا»ی زانا و مامۆستا «کیومەرث نیک ڕەفتار» بوو کە ئەویش بەڕێوەبەری پەروەردەی (پاوە) بوو کە حزبی دیموکرات شکا هاتە ئێرە، هەروەها مامۆستا عەبدولقادری دەباغی و مامۆستا مەلا عەبدولڕەحمانی پێنجوینی کە فارسی زانێکی زۆر باشە و لەوان کەمتر نەبوو، ئێستا لە دادگای سلێمانی عەریزەنووسە و بەهۆی ئەوانەوە ئەو بەڵگانە خوێنرانەوە و هەموویان زۆری پێوە ماندووبوون، بەڵام پاشان کە خۆم فێری ئەو شێوە نووسینە بووم، هەروەها شێوە نووسینە

سەختەکانی عوسمانیی سەدەی شازدەهەم و حەڤدەهەم، ئیتر لەزەتم لە خوێندنەوەی ئەو جۆرە بەڵگەنامانە نەدەدیت. زۆرجار حەز دەکەم وەک هیوایەتێ مۆر و ئیمزا و نووسینێکی زۆر سەخت بکەوێتە بەردەستم تا بە خوێندنەوەیان زۆر وەخت سەرف بکەم و لەزەت و ڕاحەتی نەفسی لە خوێندنەوەیان وەربگرم، ئەگەرچی وەختیشم زۆر لە لا پیرۆزە.

(٦) خەسڵەت و سیفەتێکی دیکە لە خەسڵەتەکانی لێتوێژەرەوە ئەوەیە کە توانای منجڕانەی بۆ لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی سەخت هەبێ، دوور نییە وەک من زۆربەی شەو ئەو شتە لە خەودا ببینێ، نەک خەونێکی ساف و ڕوون، بەڵکو بە تەمومژ ئەوە دەبینێ، جاری وا هەیە چەندین ڕۆژ مرۆڤ خەریکی مەسەلەیەکی سەخت دەبێ و لێی ماندوو نابێ کە وەختێکی زۆر بەشتی وا سەرف دەکات، جاریش هەیە بە ئەنجامی تەواو ناگات و ئەو وەختەی بە فیڕۆ دەڕوات، بەڵام پەشیمان نییە و ویژدانی حەساوە بووە، باسکار بە وەڵامێک ناتوانێ دەست لە یەخەی پرسیار هەڵگرێ و خۆیشی دەپرسێ و بەدوایدا دەچێت، هەر بە دوای ئەو شتەدا دەچێ بۆ نموونە: لەم ڕۆژانەدا بەڕێز دکتۆر (مارف عومەر گوڵ) لەناو چەند کەسێکدا پرسیارێکی لێکردم، من پێم وت واز لەو پرسیارە ناهێنم هەر بیر لەو پرسیارە دەکەمەوە، پرسیارەکەش ئەمەبوو: ئایا (سفر) ئەسڵییە، یان ژمارە (یەک)؟ کە ساڵی (٢٠٠٠) ئەم ڕۆژانە تەواو بوو و بوو بە ساڵی (٢٠٠١) واتە نوقتە (سفر)ی سێیەم بوو بە یەک (١).

یەکەمجار یەکسەر وتم یەک ئەسڵە، دوایی وتم نوقتە ئەسڵی هەموو نووسینێکە لەم جیهانەدا، لەلای فەیلەسووفەکانی یۆنان و ئیسلامیش هەر نوقتە ئەسڵی نووسینە.. شیعرێکی مەلای جزیریم بە بیرداهات کە وتوویەتی:

**نوقتەیە عیلم و سەوادێ حەرف و نەقشێ عالەمێ**
**سەرددن مەعنایەکی ئەسڵی سەوادێ نوقتە بوو**

واتە ئەسڵی زانست و نووسینی حەرف و نەقش هەمووی نوقتەیە و لە نوقتەوە دەست پێدەکات.. هەندێ شتی تر هەر لەنێو بیناکەدا هاتەوە بیرم و گەڕامەوە بۆ لایان کە سەرقاڵی شتی تر بوون، ئەمەشم لەسەر ئەو پرسیارە بۆیان خوێندەوە، کە زانا و شاعیری کوردی سەدەی یازدەمی زایینی «ئەحمەدی

کوڕی یووسفی مەنازی» کاتبی دیوانی ئینشائی (نصر الدولە)ی پاشای دۆستەکی کورد، تا (ئەبولعەلای موعەڕی) موعجەب بووە پێی، وتوویەتی:

**ولی غلام طال فی دقة**
**کخط إقليدس لا عرض له**
**وقد تناهى عقله خفة**
**فصار کالنقطة لا جزء له**

مەزهەبی (ئقلیدس)ی یۆنانی ئەوەیە هێڵ پانیێتی نییە، ئەو غولامەی (مەنازی)ش هێندە باریک بووە تا دەڵێ پانیێتی وەک هێڵی (ئقلیدیس)ی نییە، هەروەها دەڵێ هێندە عەقڵی سووکە بە قەد (نوقتە)یە کە پارچە (جزء)ی نییە، کەواتە نوقتە جوزئی (لا یتجزأ)ە قابیلی دابەشبوون نییە، بەڵام ئێستا ئەم تیۆرە بەتاڵ بووە، ئێستا گەردیلە «ذرة» (جزء لا یتجزأ)ە، چونکە ئێستا ئیسپات بووە کە گەردیلە خۆی لە چەند بەشێک پەیدا بووە، واتە ئەو تیۆرەش ئێستا بەتاڵ بووەتەوە. جیهان لای فەیلەسووفان لە دوو شت پێکدێ «عین» واتە (جسم) و (عین)یش وەها (تعریف) کراوە: «مایقوم بذاته»، هەروەها جیهان پێکهاتووە لە (اعراض) و (اعراض)یش «مایقوم بغیره»، واتە خۆی بە نەفسی خۆی ناگرێ و خۆی بە شتی ترەوە دەگرێ وەک ڕەنگ؛ ڕەنگ بە تەنیا بە نەفسی خۆی ناگرێ، پێویستە بە شتی ترێ بدەی تا خۆی بگرێ، یان تام کردنی شت ئەو تام کردنە پێویستە لەگەڵ خواردنێک بێ تا تام بدات کە (اعراض)ە. ئاوێتە (مرکب) خۆیشی وەک (جەستە - جسم) لە دوو بەش یان سێ پێکدێ، دوو بەشی گەورە.

هەندێ لە فەیلەسووفان دەڵێن (جەستە) ئەوەیە هەر سێ (ڕەهەند - بعد) درێژی و پانی و قووڵی هەبێ، هەندێ دەڵێن نەخێر پێویستە لە هەشت بەش دروست ببێ، ئەبووعەلی جەبائی کە موعتەزیلە بوو، مامۆستای ئەبوو حەسەنی ئەشعەری بوو دەڵێ: پێویستە لە شەش یان لە چوار بەش دروست ببێ، ئەو جەستەیەی ئاوێتە نەبێ (جزء لایتجزأ)ە، بۆ نموونە جەوهەر کە قابیلی دابەش بوون نییە، وەک «نەسەفی» لە کتێبی (عقائید)دا دەڵێ، بەڵام (سعدالدینی تەفتازانی) کە یەک لە زانایە گەورەکانی ئیسلامە دەڵێ: «ئەو عەینە، ئەو جەستەیەی کە قابیلی دابەشبوون نییە نەک هەر جەوهەرە، شتی دیکەشی

هەیە..» ، چونکە ئەگەر هەر ئەوە بێ مانای وایە پێویستە تیۆری هیوللاو وێنەی (هیولی) و (وێنە)یە عەقڵ و نەفسی موجەڕەد بەتاڵ بن، فەیلەسووفانی یۆنان دەڵێن جیهان لە مادەی یەکەم کە هەیوللایە پێکهاتووە، ئەمەش کۆنە، ئەگەر کۆن بێ واتە پێچەوانەی تیۆری زانایانی ئیسلامە، چونکە عالەمەکە تازە (محدث)ە و خودا یەک عالەمی خەڵق کردووە، حسی موجەڕەدەش وەک (فریشتەکان) فەیلەسووفەکانی یۆنان وتوویانە (جەوهەری فەرد) نییە، (عقولی موجەڕەد)ە نییە، ئەگەر هەبێ پێچەوانەی تیۆری هەیوللا و وێنەیە، بەڵام زانایانی ئیسلام دەڵێن: گەورەترین بەڵگە لەسەر ئەوەی نوقتە قابیلی دابەش بوون نییە، یانی (لا یتجزأ)ە، (جەوهەر)ە کە نوقتەیەکی (لایتجزأ)ە، بەڵگەش لەسەر ئەمە دەڵێن ئەگەر تەنێکی بازنەیی خڕت خستە سەر ڕووبەرێکی تەخت، کەوتنی لەسەر ئەو ڕووە هەر دەبێ بەشێوەیەکی ناموستەقیم دەربچێ، واتە هێڵێکی ڕاست دروستی ناکات، هێڵی ڕاست لە چەند بەشێک پێکدێ کە نوقتەکانە، کۆتاییشی بە نوقتە تەواو دەبێ، ئەو کۆتاییە نوقتەی دابەش لەبووە، هەر شکڵێکی (مەخروطی) سەرەتا و دوایی بە نوقتە کۆتایی پێدێ، تیۆری تر هەیە دەڵێ: پێویستە هەر (عەین)ێ بۆ هەندێ بەش دابەش ببێ کە پێویستە کۆتایی پێبێ، چونکە ئەگەر بەشتێک کۆتایی پێ نەیەت، واتە شاخێک و خەردەلێک (خردل) وەک یەکتریان لێدێ، مەزنایی شاخ ئەوەیە، چونکە بەشەکانی لە دەنکە خەردەل زۆرترە. هەندێکی تر لە فەیلەسووفەکانی یۆنان دەڵێن (جەستە) قابیلە بۆ دابەش بوون، ئیتر لەوانەیە زانست لە پاشەڕۆژدا ئەوە بزانێ کە ئێستا دەڵێن گەردیلە (ذرة) چەند جوزئێکە، ڕەنگە ئەو جوزئانەش لە پاشەڕۆژدا شتی تریان لێ ببێتەوە، سەبارەت بە پرسیاری (د. مارف عومەر گوڵ) (سفر) ئەسڵە یان (ژمارە یەک)، ئەگەر لەشێوەی (خەت) تەماشای ژمارە «١» بکەین ئەوە لە سێ نوقتە پێکدێ، چونکە لە قەبارەی ئەلیفەکە سێ نوقتەیە. لە زانستی دەنگەکانیش (تجوید- علم الأصوات) لە بری نوقتە جووڵە بەکاردێن، ئەلیف لە سێ جووڵەی پەنجەی ناوەندی پێکدێ کە ئەلیف و ژمارە، یەک قەبارەن.

ئەلیفی مەمدودە وەک لە زانستی تەجویددا هەیە لە پێنج جووڵە پێکدێت، مەبەستم لە ئەلیف، ئەلیفی خەتی نەسخە (خط النسخ) نەک خەتی (الثلث).

ئیتر بەم جۆرە سیفاتەکانی لێتوێژەرەوە زۆرن، لەوانە دەبێ ئەمانەتی زانستی

بپارێزێ و ڕاستگۆ و نەترس بێ و خۆی لە بەرژەوەندی کەسیی دوور بخاتەوە و لە پێناوی ڕاستیدا کار بکات.

* باسی هۆیەکانی هەڵەتان لە مێژوودا کرد. مێژووی کۆن ڕاستترە، یان مێژووی نوێ و هاوچەرخ؟

- یەکێ چووە لای (ئەبوو ئیسحاقی صابی) کە لە (٩٩٤)ی زایینی کۆچی کردووە، لە زەمانی بووەیهی لە بەغدا کاتبی دیوانی ئینشا بوو، بینی شتێک دەنووسێ پێی وت چی دەنووسی؟ وتی «أخبار أنمقها و اکاذیب ألفقها..» یانی هەندێ هەواڵ بەجوانی ڕێک دەخەم و درۆ دروست دەکەم کە مەبەستی لە نووسینی مێژووە، گەورەترین گیروگرفتی نووسینی مێژووی کاتی ئیسلام ڕۆڵی مێژوونووسە لە شوێنی ڕووداوەکان، کە لەبەر نەبوونی ئامرازەکانی هاتوچۆ نەیتوانیوە بگاتە ئەو شوێنانە، هۆیەکانی هاتوچۆ کردنی ئێستا وەک فڕۆکە و ماشێن نەبووە، دەنگ و باس بە زەحمەت وەردەگیرا، دەنگ و باس لەوپەڕی جیهانی ئیسلامی دەگەیشتە میسر و باکووری ئەفریقیا، بۆیە مێژوونووسان زۆر لە ڕووداوەکانیان دوورا و دوور نووسیوە، یەکێک لە میسر دانیشتووە دەربارەی ڕووداوەکانی عێراق و ئێرانی نووسیوە، یانی مێژوونووسێ لە سەمەرقەند و بوخارا دەنگ و باسی میسری نووسیوە، زەحمەت بوو ڕاستیی زانیارییەکانی پێ بگات، مەگەر لە ڕێبوارێ کە لەو شوێنەوە دەهات و ماوەیەکی زۆریشی بەسەر تێدەپەڕی، کە باسیشی دەکرد هەمووی لە یاد نەمابوو، دووریش نییە بە هەڵە بۆ مێژوونووسەکەی باس کردبێ، ئەمە گەورەترین هۆی ئەوەیە کە هەڵە کەوتۆتە ناو مێژووی سەدە ناوەنجییەکانی کاتی ئیسلامدا.

بە نیسبەت ئێستاوە گەورەترین هۆکاری ڕوودانی هەڵە لە مێژوودا، سیاسەتی چەواشەکارانەی ئێستای دنیایە، وێڕای ئەو هەموو هۆکارە ئاسانەی کە لە هاتوچۆ و وەرگرتنی دەنگ و باسدا هەیە، کە دەتوانین دەنگ و باسی ئەوپەڕی جیهان لە ماڵی خۆماندا وەربگرین، لەگەڵ ئەم ئاسانی وەرگرتنی زانیاریانە ئێستا نووسینی مێژوویەکی ڕاستەقینە زۆر زەحمەتە، وەرگرتنی زانیاری ڕاست زۆر زەحمەتە، چونکە دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە دەستی حزب و دەوڵەت و چەندین جۆرە ڕژێمدایە کە لە ئەندازە بەدەر لە کەناڵەکانی بینین و بیستن و نووسیندا زۆر ڕاستی چەواشە دەکەن، زۆربەی ئەوانەی لەسەر

مێژووی سەدەی بیستەم دەنووسن لەژێر کاریگەریی فەوزا و درۆی سیاسەت و ڕژێم و حزبەکاندان، ئیتر کاری مێژوونووسینیان دەبێ چۆن بێ؟ زۆربەیان هەواداری ئەو حزب و ڕژێمانەن و بەپێی خواستی ئەوان دەنووسن، زۆر زەحمەتیشە مێژوونووسێکی بە ویژدان زانیاری ڕاستەقینە وەربگرێ، بۆ نموونە لەم ڕووداوانەی پاش ڕاپەڕینی کوردی (١٩٩١) دوو ڕوویان هەیە، ڕووی سەرەوە کە حزبەکان بڵاوی دەکەنەوە، ڕووی ژێرەوەش کە نهێنییە لای خۆیان، ئەو حزبانە ناهێڵن ئەو نهێنییانە بگەنە دەستی مێژوونووسان، لەلایەکی دیکەوە زۆربەی ئەو خەڵکەی مەیلداری حزبێکن، ئەگەر مرۆڤێ پرسیاریان لێ بکات گوێ نادەنە ئەمانەتی زانستی، بەشێوەیەک دەیڵێن کە لەگەڵ سۆز و بیروباوەڕیان لەگەڵ حزبەکانیان بگونجێ، بۆ نموونە لە (١٩٩٣) شەڕێک لەنێوان گرووپی کەریم ئاغای هەمەوەند و هەندێ گرووپی سەر بە یەکێتی نیشتمانی لە چەمچەماڵ ڕوویدا، من لای ڕەحمەتی (ڕەسووڵ مامەند) دانیشتبووم لە ڕانیە، نامەیەکی بۆ هات کە خوێندییەوە نووسرا بوو (٣٣) کەس لە شەڕەکەدا کوژراون، پاشان خۆم تەعقیبی ئەو ڕووداوەم کرد تا بزانم چەند کەس لە هەمەوەندییەکان کوژراون و چوومە لای چەند حزبێک لە هەمووانم دەپرسی، بەڵام هەریەکەیان شتێکی دەوت، ویستم بەڵگەی نووسراو بکەوێتە دەستم، ڕاپۆرتێ لە حزبێکی کە من گومانی باشیم لێدەکرد کە لەو ڕووداوەدا لایەندار نەبوو، چوومە لای - پاسۆک- لە خوالێخۆشبوو (مولازم کەریم)م پرسی: ئایا ڕاپۆرتێکتان دەربارەی ئەو ڕووداوە هەیە؟ وتی نەوەڵڵا نیمانە، بەڵام ئەم مامۆستایە ئەندامی لیژنەی لێکۆڵینەوەی ئەم شەڕە بووە لەگەڵ نوێنەرانی هەندێ ئەحزابی دیکە ئەو لە هەمووان باشتر ئاگەدارە، منیش لە مامۆستام پرسی کە لەوێ دانیشتبوو، وتم چەند کەس کوژراون؟، وتی (١٧٠) کەس کوژراوە، تەماشام کرد مامۆستا چەندین جار لە ڕاستی دوورترە لەو کەسانەی پێشتر لێم پرسیبوون، ڕەنگە هەندێکیان ڕاستیشیان وتبێ، کەچی مامۆستا ژمارەکەی زۆر زیاتر وت، لەکاتێکدا ئەمە ئەندامی لیژنەی لێکۆڵینەوە بوو، ئینجا بە تەواوی زانیم وەرگرتنی زانیاری لەناو خۆماندا زۆر زەحمەتە بەشێوەی ڕاست بگاتە دەستی مرۆڤ.

بیستوومە لە هەندێ لە زانکۆکانی وڵاتانی ڕۆژئاوا زۆر بەحەزەرن لە وەرگرتنی زانیاریی، لەبەر ئەمە ڕێگەنادەن تێزی دکتۆرا و ماجستێر لەسەر

ولاتێ بنووسرێت کە ڕژێمەکەی هەر لەسەر حوکم مابێ، بەڵکو دەبێ نزیکەی (٥٠) ساڵ بەسەر ئەو حوکمەدا تێپەڕیبێ، ئینجا ڕێی پێ دەدرێ تێزی لەسەر بنووسرێ تا ڕێگە نەدرێ هەڵە بکەوێتە ناو ئەو تێزانە و لەژێر کاریگەریی ڕژێمەکاندا نەبێ.

هەندێ زانکۆی ولاتانی سۆسیالیست، بەتایبەتی هی یەکێتی سۆڤیەتی جاران دیقەتی زانستییان نەبووە و لایەنی بەرژەوەندیی سیاسییان لێکداوەتەوە. بۆ نموونە لە سەرەتای حەفتاکان من لە شاری مەندەلی مامۆستا بووم دراوسێیەکمان هەبوو ناوی خاڵە (ڕەمەزان شەفی) بوو باری ئابووری خراپ بوو، لە دوکانێکی بچکۆلەدا دادەنیشت و سەیرمان پێدەهات، زۆر سادە بوو تا چەند ساڵ لە کەرکووک مابوو، بەلام بەتەواوی فێری ناوی کەرکووک نەببوو پێی دەوت (کەرکوێت) بە سەیدەلی دەوت (سەی عەلی)، ناوی منیشی بە ڕاستی نەدەوت، جارێک چوو شەکر و چای بایعی وەربگرێ کە گەڕایەوە پێی وتم کە چووم شەکر و چا وەربگرم ئەمەیان بەمن داوە بزانە ئەمە چییە؟ تەماشام کرد نامیلکەیەکە، بڕوانامەی ماجستێری (خورشید ڕەواندزی)یە لەسەر مەسەلەی کەنداوی نێوان عیراق و ئێران، بینیم بڕوانامە بچووکەکەی لە زانکۆیەکی سۆسیالیستی لە چیکوسلۆفاکیای دۆستی عیراق وەرگرتووە و چەند جنێوێکی بەشای ئێران داوەو لە چەند وتارۆکەیەکی ڕۆژنامەکانی عیراقی کاتی بەعس و شتێکی وا پێکهاتووە، مامۆستای سەرپەرشتیاریش لە پێشەکییەکەیدا بە گەرمی ئەم بڕوانامەیەی هەڵسەنگاندووە و ستایشی هەوڵ و ماندووبوونی خاوەنەکەی کردووە، گومانم هەبوو لەوەی ئەمە هەموو ماجستێرەکەی بێ، وامدەزانی حکومەت هەندێ شتی لێ دەرهێناوە و بۆ پڕوپاگەندەی خۆی بلاوی دەکاتەوە، پاشان پرسیم وتیان ئەمە هەموویەتی. ئایا زانکۆیەک چۆن ڕازی دەبێ بڕوانامەی ماجستێری قوتابییەک بەم شێوەیە بێ؟

جار هەیە مێژوونووس زانیاریی دەربارەی ژیانی کەسێک وەردەگرێت لە کەسەکە خۆی دەپرسێ، بەلام ئەو کەسە خۆی زانیاریی هەڵە دەداتە مێژوونووس، تەنانەت دەربارەی ژیانی خۆشیان زانیاریی هەڵە دەدەن، لەبەر ئەمە مێژووی سەدە ناوەنجییەکان بە ڕاستتر دەزانم لە هی ئێستا، هۆکاری تر هەیە کە بۆچی هی پێشوو ڕاستترە، مێژوونووسانی ئەوکاتە زۆربەی زۆریان

دیندار بوون بە هۆی ئایینە پیرۆزەکان خۆیان لە درۆ دوورخستۆتەوە، بۆیە مێژووی ئەوکاتە لە هی ئێستا ڕاستترە، لەبەر ئەم سیفەتەی مێژوو کە موعەڕەزە بۆ هەڵەی زۆر، هەندێ کەس خۆیان لە نووسین و وتنی مێژوو دوورخستووەتەوە، بەتایبەت ئەوانەی دیندار بوون. ئەگەر مێژووش نەنووسرێ، ئەوە ڕابردووی مرۆڤ تاریک دەبێ، ئێمە بەهۆی مێژووەوە دەزانین ڕابردووی مرۆڤ چی بووە و چی نەبووە، شوێنەواریش بەشێکە لە مێژوو، مێژوونووس دەبێ هەوڵ بدات زانیاریی ڕاست دەربخات و لەژێر کاریگەریی هیچ لایەنێکی سیاسیدا نەبێ، هەندێ کەس خۆیان لە نووسینی مێژوو دوور دەخەنەوە، بۆ نموونە مەحفووز عومەر ئەلعەباسی کە ئەفسەرێکی پۆلیس بوو لە زوڕیەتی میرانی باهدینان- لقی مووسڵ کە کوردیشی نەدەزانی. من (محفوظ)م لە ساڵی (١٩٦١) بینی کاتێ لە کتێبخانەی مۆزەخانەی مووسڵ کە یەکەم کتێبخانە بوو تێیدا فێری نووسینی مێژوو بووم و سەرچاوەی زۆر گرنگی تێدا بوو، ئەمیندارەکەی خوشکە (ناثرة)ی عەرەبی مووسڵ بوو، کچێکی ڕەوشت بەرز بوو، منی بە مەحفووز ناساند، ئیتر بۆ منی باس کرد کە کتێبێ سەبارەت بە مێژووی میرنشینی بەهدینان دادەنێ و وتی میرانی بەهدینان لە زوڕیەتی خولەفای عەباسین، منیش وتم ئەمە ڕاست نییە، هەندێ بەڵگەم بۆ هێنایەوە، پاشان بەڵگەی باشتریشم کەوتە دەست، زۆر تووڕە بوو، دەستی خۆی ڕووت و درێژ کرد و تەماشای کرد و وتی: «أری دم العباس یجري في عروقي» واتە وتی: من خوێنی عەباس لە دەمارەکانمدا دەبینم هاتوچۆ دەکات، کە عەباسی مامی پێغەمبەری مەبەست بوو.

لە (١٩٦٩) کتێبەکەی خۆی بەناوی «إمارة بهدینان العباسیة» چاپ کرد، لە (١٩٨٢/٢/٣) لە مووسڵ چوومە ماڵی و بەمنی وت وازم لە نووسینی مێژوو هێناوە، چونکە زۆر درۆ دەکەوێتە ناو مێژووەوە، ئێستا من ڕووم لە ئایین کردووە و بوومەتە دیندار. هۆدەیەکی خۆشی وەک مزگەوت لێکردبوو، وتی هەر کاغەزێ کە لە بارەی شتی مێژوویی کۆم کردبوویەوە هەموویم سووتاند، وەک (مەخطوطی زێوکی) و نامە دەستنووسەکانی (دکتۆر مستەفا جەواد) کە ڕەخنەی لە کتێبەکەم گرتبوو، پاش ئەوەی دانەیەکم بۆ ناردبوو ئەویشم لا بوو کە شازدە لاپەڕە بوو، شانازیم پێوە دەکرد و لە چوارچێوەم گرتبوو ئەوەشم سووتاند. زۆر بەمە تێک چووم، چونکە سەرسامم بە موستەفا

جەواد کە بە بنەچە خەڵکی قەرەتەپەی کفرییە، بە منی وت لەنێوان کورد و تورکمانم کە بنەچەی خۆم بۆ روون بوویەوە بە تۆ دەڵێم، من سەرسام بووم بە توانای ئەو پیاوە مەزنە، مەحفوظ وتی دکتۆر نووسیبووی ئەوەی نووسیوتە میرانی بەهدینان لە زورییەتی عەباسییەکانن هەڵەیە، ئاماژەی بە سەرچاوەش دابوو، مامۆستا سەعید دیوەچیش زۆر پێی ناخۆشبوو کە زانیاریی مستەفا جەوادی سووتاندووە.

بە نیسبەت منەوە زیاتر لە (٣٠٠) سەعات بیرەوەری بە تەمەنەکانم لەسەر رووداوەکانی کوردستان تۆمار کردووە، هەندێکیان زانیاریی سەرپێیین، هەشیانە لە رووداوەکاندا بەشداربووە کە پێم راستترە، ئەوەی دەماودەم بیستوونی زۆر جێگەی پشت پێ بەستن نین، چونکە هەڵەی تێدا دەکرێت، ئینجا من وەسییەتم ئەوەیە ئەو هەموو زانیاریانە بپارێزرێن و تەدقیق بکرێن، رووداوی وا هەبووە وەک بەڵگەنامە بە دەنگی چەندین کەس بیستوومە، وەک شەڕی شوعەیبە و شەڕی رووس کە شێخ مەحموود لەگەڵ عەشایەر چووەتە شەڕی رووس لە شەڕی جیهانی یەکەم لە ناوچەی سەقز و بانە تا ئەولای بۆکان، یان دەربارەی شەڕی ئاوباریک لە چەندین کەس زانیاریم وەرگرتووە کە خۆیان تێیدا بەشداربوون. لە بەراوردکردنی قسەکان هەندێ هەڵەی تێدا دەدۆزرێتەوە، وەسیەتم ئەوەیە هەر کەسێ دوای من ئەم زانیاریانە بڵاوبکاتەوە باشترە دیقەتی تێدا بکات، وەک ئێستا کە گومانم لە زۆر زانیاریی هەیە، تا ئەو زانیاریانە بەشێوەیەکی راستتر چاپ بکرێن و هیچ گوناهێ لەسەر من نەمێنێ.

زیاتر من تەعقیبی مێژووی کۆن و سەدە ناوەنجییەکانم کردووە، لە مێژووی نوێشدا زۆر شتم نووسیوە، هەندێ جار دەڵێم خۆزگە من نەمنووسیبا، چونکە زۆر دەترسم هەڵەی تێکەوتبێ، پێویستە ئەم بابەتانەش چاک و راست بکەمەوە، ئەگەر فریاش نەکەوتم وەک لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە «الموت أقرب اليكم من حبل الوريد» و من مردم، ئەوکەسەی لەو بابەتانە دەکۆڵێتەوە، لە هەڵە پاکیان بکاتەوە، یەک لە هۆکارەکانی روودانی هەڵە لە مێژوودا ئەوەیە مرۆڤ بکەوێتە ژێر باری سۆزی نەتەوایەتی کە لای منیش هەیە، لەبەر ئەوە ئەگەر لەبارەی مێژووی نوێم نووسیبێ، رەنگە هەندێ هەڵەی تێکەوتبێ، چونکە لەو رووەوە شتمان نووسیوە و هەر پشتگیری کوردمان کردووە، یان

ئەگەر لە مەسەلەیەکی جوزئیدا خەتا و سووچێ هەبووبێ بەرامبەر دوژمنەکانی دامانپۆشیوە، ئەمانە هەمووی هەڵەی مێژووییێ، زانایانی بەرنامەی لێتۆژینەوەی زانستی دەڵێن زۆر زەحمەتە مرۆڤ لەو سۆزی نەتەوایەتییە رزگاری بێ، بەڵام دەبێ ئەو سۆزە بەشێوەیەکی وانەبێ لە مێژوو نووسیندا مرۆڤ تووشی هەڵە بکات.

* زۆر سوپاس.. بەڕاستی ماندوومان کردی، لەمێژە و بە چەند قۆناغێک ئەو هەڤپەیڤینە فراوانەمان لەگەڵتدا سازدا، بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی هوشیاریی مێژوویی و کەلەپووریی و بەڵگەنامەیی.

– منیش زۆر سوپاستان دەکەم، مەوزووعەکە ماندووبوونی هەردوولا هەڵدەگرێ، زانیاریی باشی لە چەندین بواردا تێدایە.

* هیوادارین بە تێروتەسەلی قسەی دڵی خۆتان کردبێ؟

– پێم وایە تا ئێستا هیچ گۆڤار و ڕۆژنامەیەکی کوردی لەم جۆرە هەڤپەیڤینە فراوانەی لە بەسەرکردنەوەی چەندین بابەتدا ساز نەداوە کە شانازییەکەی بۆ زیرەکی و دڵسۆزی و شارەزایی خۆتان لە بواری ڕۆژنامەنووسی و ڕۆشنبیریدا دەگەڕێتەوە. ئەم کارەتان دەبێتە کارێکی نموونەیی لە بواری هەڤپەیڤیندا.

* لە ژمارە (١٣٧)ی ساڵی حەوتەم، ڕێکەوتی ڕۆژی شەممە (٢٠٠٢/١١/٣٠) لە ڕۆژنامەی (میدیا)، ڕووناکبیری نەتەوەپەروەر (د. جەمال نەبەز) لە ستایشی ئەم پیاوە خزمەتگوزار و پاکەدا نووسیویەتی:

ڕەقیب، ڕەقیبی، ڕەقیبانت بێ
ئاهورامەزدا، پشتیوانت بێ
خوای گەورە کەسی، بێکەسانت بێ
سیمیاری مەزن، نزا خوانت بێ
تاوسێ مەلەک، پاسەوانت بێ
پاپەک، لە دستەی هاوبیرانت بێ
زانای سۆرەوەرد، لە یارانت بێ
سەهاکی سوڵتان بە میوانت بێ
لانەی سەربەرزان، ئاشیانت بێ
فریشتەی شادی، دستلەملانت بێ

تۆیش دەبێ سینگی فراوانت بێ
خزمەت بەرنامەی، کشت ژیانت بێ
تا ماوی خەمی، کوردستانت بێ
شەڕی ملهوڕ و زۆردارانت بێ
دژ بە کەریپیاوان، ململانت بێ
شیلەی تێکۆشان، نۆشی گیانت بێ
سەت جەمال نەبەز، بە قوربانت بێ

**بەرهەمە چاپکراو و چاپ نەکراوەکانی عەبدولڕەقیب یووسف**

(١) دیوانا کرمانجی (لە مێژووی ئەدەبی کرمانجی دا)، چاپی یەکەم، بەغدا ١٩٧١، چاپی دووەم بە لاتینی - سوێد، وەرگێڕی عەرەبی بە ناونیشانی (الديوان الكردي، لە لایەن محمد نیو - بیروت - ١٩٩٤).

(٢) الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى. بەرگی یەکەم کۆڕی زانیاری کورد چاپی کرد لە بەغدا ساڵی ١٩٧٢، بەرگی دووەمی لە ١٩٧٥ لە بەغدا چاپ کرا، بەڵام حکوومەتی عیراق (٣٠٠٠) دانەکەی ناردە کارگەی کاغەز دروستکردن لە شاری بەسرە و هەمووی کردە هەویر و کاغەزی سپی. لە (٢٠٠١)دا بەرگی دووەم لە لایەن دەزگای ئاراسەوە لە هەولێر چاپ کراوە.

(٣) بانگەوازێک بۆ ڕووناکبیرانی کورد لە پێناوی کۆکردنەوە و زیندووکردنەوەی کەلەپووری کوردیدا. کتێبخانەی هاوسەر - ١٩٨٥.

(٤) تابلۆکانی شەرەفنامە، چاپی یەکەم.. بە لاتینی لە سوێد چاپ کرا (١٩٩١) دەزگای ژینا نوێ چاپی دووەم - ١٩٩٨ وەزارەتی ڕۆشنبیری - هەولێر.

(٥) شوێنەوارەکانی نەوێ لە شاخی سورێن - ١٩٩٤.

(٦) یاداشتی ئەحمەدی حەمە ئاغای پشدەری، سلێمانی (٢٠٠١) لەگەڵ سدیق ساڵح ئەحمەد.

(٧) بەرسیسی عابدی فەقێی تەیران - (٢٠٠١).

(٨) مێجەر نوئێل/ سەرنجدانێکی بارودۆخی کورد، بە هاوکاری لەگەڵ سدیق ساڵح، سلێمانی (٢٠٠١).

(٩) پەیدابوون و دروستکردنی چەکی ئاگردار لە کوردستان (٢٠٠٤)، سلێمانی - بنکەی ژین.

(١٠) لە بەڵگەنامەکانی حکوومەتی شێخ مەحموود - تۆمارێکی شارەوانی سلێمانی، بە هاوکاری لەگەڵ سدیق ساڵح (٢٠٠٤) سلێمانی.

(١١) حدود كردستان الجنوبية تاريخياً وجغرافياً خلال خمسة آلاف عام، ساڵی (٢٠٠٥) وەزارەتی ڕۆشنبیری - سلێمانی.

**کتێبە بڵاونەکراوەکان کە هەندێکیان تەواوکراون و هەندێکیان تەواونەبوون**

(١٢) أعلام الكرد وكردستان، چەند بەرگێکە.

(١٣) البلدان الكردية.

(١٤) جغرافية كردستان الجنوبية.

(١٥) انتشار الديانة المسيحية في كردستان.

(١٦) منهج البحث لكتابة تاريخ المدن مطبقاً على المدن الكردية.

(١٧) الامارة النميرية في بلاد الجزيرة.

(١٨) پەرستگەی میترایی دهۆک.

(١٩) یووسف و زولەیخا، تۆژینەوە و بەراورد لەبەر ڕووناکی سێ دانە دەستنووس.

(٢٠) شوێنەوارەکانی قەمچووغە لە شاخی سورداش.

(٢١) گەشتێکی ئارکیۆلۆجی د کوردستانا باکووردا - سالی ١٩٧٧.

(٢٢) قەر و گولەزەر.

(٢٣) یاداشت لە هەشت بەشدا.

(٢٤) بیرەوەری بەساڵاچووەکان، چەند بەرگێکە.

(٢٥) شوێنەوارەکانی ئاکرێ (تەواو نەبووە).

(٢٦) هونەری تەلارسازی کورد (تەواو نەبووە).

(٢٧) کەلەپووری شارستانێتی کورد لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا.

(٢٨) قەڵاچوالان.

(٢٩) تۆماری بابانی.

(٣٠) بەڵگەنامەکانی شۆڕشی بەدرخان.

(٣١) یاداشتی هەمزە عەبدوڵڵا، بە هاوکاری لەگەڵ سدیق ساڵح.

(٣٢) یاداشتی محیەددین چنارەیی، بە هاوکاری لەگەڵ سدیق ساڵح.

(٣٣) بۆردومانی کیمیاوی کوردستان.

(٣٤) مانگرتنی ١٩٩١.

(٣٥) سەڵاحەدینی ئەیووبی بە ئەسڵ خەڵکی دوینی ئەرمەنستانە نەک دوینی هەولێر.

(٣٦) دەنگوباسی شۆڕشی کورد لە ١٩٨٨/١/٢٩ تا ١٩٩٠/٥/٣٠.
(٣٧) کیمیابارانی هەڵەبجە و کوردستان.

**تێبینی:**
(أ) تا ئێستا (٣٣٥) لێکۆڵینەوە و وتاری بڵاوکردووەتەوە.
(ب) گرتنی بیست و دوو هەزار وێنە لە شوێنەوار و کەلەپووری کوردیدا لە کوردستانی باکوور و باشوور و ڕۆژهەڵاتدا. کاتێ چاوپێکەوتنەکەمان لەگەڵی سازدا ژمارەی وێنەکان (١٦) هەزار بوو.
(ج) ئامادەکردنی کەرەستە بۆ چەندین کتێبی دیکە وەک بەڵگەنامەکانی شۆڕشی محەمەد پاشا ڕەواندزی و بەڵگەنامەکانی میرنشینی بابان و ئەردەڵان و موکری و بەهدینان و هەکاری.

زەهاو - تەها باقر و فوئاد سەفەر
ئانۆ بانینی پادشای گەلی لۆلۆ لە ڕەچەڵەکی گەلی کورد، کە پێش چوار هەزار ساڵە

لەم بەڵگەنامەیەی عەبدولکەریمی عەلەکەدا کە نامەیەکی (هرمز مسیحی)ی مووسڵاوی وەکیلیەتی، لە شاری (بانە)وە لە (٢٩)ی تەمموزی ساڵی (١٩٢٢) بۆی نووسیوە کە سەرکردەی شۆڕش ئیسماعیل خان (سمکۆ)، سەیفولقوزات و خەلیفە سیراجەددینی ناردووەتە لای بەگزادەکانی بانە و لەوێش دەچنە لای مەحموود خانی کانی سانان لە مەریوان و مەحموود خانی دزڵی لە هەورامان و سەردار ڕشیدی لە نەوەکانی میرانی ئەردەڵان تا ببنە یەک دەست و هێز و بەشداری لە شۆڕشدا بکەن و شۆڕشەکە فراوان ببێ، بۆیە تا ناوچەی مەریوان و هەورامان و ناوچەی سنە و بەگزادەکانی بانە پێکهاتووە و سێ سەد سواریان بۆ ناوچەی سەقز و موکری ناردووە.

ئەم زانیارییە گرنگە لە هیچ سەرچاوەیەکدا لەبارەی شۆڕشی سمکۆ نەنووسراوە، بۆیە دەبێ چەند هەزار بەڵگەنامەی لەو جۆرە پڕ لە زانیاری لەبارەی بارودۆخی سیاسی کوردستان و نامەکانی شێخ مەحموود و کەسانی دیکەش لەلایەن ئەو کرێچییە لەناوچووبن.

پشکنینی ئەوراق و بەڵگەنامەکانی تەکیەی (شێخ باقی) لە کەرکوک
(١٧ - ٢١/ ٥/١٩٨٤)

وێنەی (عەلی نەققاشی کەرکووکی)
لەساڵی (١٩٦٤) کۆچی دوایی کردووە.

دەستکردی (عەلی نەققاش) لە کەرکووک
(١٣٤٠ک - ١٩٢١ - ١٩٢٢ز)

ستوونی خانووی عەتاولاغا لە هەولێر
لە پاش ڕاپەڕین ڕووخاندوویانە

**ستوونێک لە خانووی عوسمان میران لە شەقلاوە، کە لە ساڵی (١٩٢٦)دا لەلایەن وەستا (مستۆی هەولێری) دروست کراوە، ئێستا ئەم ستوونە نەماوە و لە (١٢/ ٨/ ١٩٨١) وێنەی گیراوە.**

زاخۆ - گۆڕی یەکێک لە بنەماڵەی شەمدین ئاغا

کێلە قەبرێک درێژاییەکەی (٤م) بەرزە و نزیکەی (٢م) لەژێر زەوی دایە.
لەناو گۆڕستانی بەردە حوشتر لە دێی (پاشقوتەل) ل باکووری شاری ڕانیە.
لە (٢٥/ ١٠/ ١٩٨٥) وێنەکەی گیراوە

خانووی ڕەسووڵ ئاغا و کاکە جاف لە کۆیە
لە (١٣٠١ک - ١٨٨٣ - ١٨٨٤ز) دروست کراوە

مەندەلی - بن تاقێک لە لای خانووی چەلەبییەکان

خانووی سالحی ئەحمەد زادە لە سنە - شەقامی نەمەکی
دستکردی وستا (حاجی میرزا مەحموودی موئەسسی غەفاری) کە
نزیکەی (٦٥) ساڵ پێش ئەمڕۆ ئاوا کراوە.

**دیاریی هونەرمەند حاجی مەکی عەبدوڵڵا**
**بۆ مامۆستا عەبدولڕەقیب یووسف**

نەخۆشخانەی سەربازی ئینگلیزەکان
خانووی (حاجی ڕەشید عوسمان چاوەیش)

خانووی حاجی سەعید توورتنچی لە سلێمانی
لە نەخشەکانی وستا (گوڵ محەمەد)

خانووی عوسمان میران لە شەقلاوە
لە دەستکردی وەستا (مستۆی هەولێری)

ئەشکەندەری - شەقلاوە
لە دەستکردی وەستا مستۆی هەولێری ساڵی (١٩٢٦)، کە هەژدە نەخشی لەسەر هەڵکۆڵیوە، بەداخەوە لەناوچووە.

دەرگایەکی داری نەخشدار لە دەستکردی وەستا مستۆی هەولێری
خانووی عوسمان میران لە شەقڵاوە

**نەخشی خانووی عەتاولاغا لە هەولێر**
**لە پاش ڕاپەڕین ڕووخاوە**

نەخشی دەرگایەک لە دەستکردی وەستا مستۆی هەولێری

لەتە دەرگایەکی نەخشدار
دەستکردی وەستا مستۆی هەولێری
خانووی میرانی قادر بەگ لە شەقلاوە کە ساڵی (١٩٢٦) دروست کراوە

**دەرگایەکی نەخشدار لە خانووی عەتاوڵاغا کە بە نارنج و ئابنووس دروست کراوە، دەستکردی وەستا مستۆی هەولێری**